# مزگەوتەکانی کوردستان

## لەنێوان

# ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا

علی باپیر



أن المساجِد لله فلا تدعوا مع الله احداً

چاپی یەکەم

١٤١٩ ك

١٩٩٩ ز

# مزگەوتەکانی کوردستان

# لەنێوان

# وێران کردنو ئاوەدان کردنەوەدا


عەلی باپیر

ameer.maktab@yahoo.com





چاپی یەکەم

١٤١٩ ك ١٩٩٩ز

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ماكان للمشركين أن يعمروا مساجد الله شاهدين على أنفسهم بالكفر أولئك حبطت اعمالهم وفي النارهم خالدون * انما يعمر مساجد الله من آمن بالله واليوم الآخر وأقام الصلاة وآتى الزكاة ولم يخش الا الله فعسى اولئك أن يكونوا من المهتدين﴾ (التوبة: ١٧-١٨)،

---


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

## پێشکەش بێ

بـەو مسـوڵمانە پارێزکـارو فیداکارانـەی شـەوو ڕۆژ سـەرگەرمی ئـاوەدان کردنـەوەی ماڵـەکانی خـوای پەروەردگارن و، شێلگیرانەش لەفێرکردن و پەروەردەکردنی بـەندەکانی خـوادا دەست بـەکارن و، هـەرچۆنێکی بـووەو بەهـەرچی تێ‌ی‌چـووە مـەودا نـادەن ماڵـەکانی خـوا وێـران بـن و بـەندەکانی سـەرگەردان و بێلانـە بـن.

# ئەم نامیلکەیە

ئەم نامیلکەیە جگە لە(پێشەکی)یەکەی و (چەند ڕوونکردنەوەیەکی تر...)و (دوا قسەم) دەقی ئەو وتارەیە کەبەندە لەڕۆژی (١٩ی شەوال ی ١٤١٩) بەرانبەر: (١٩٩٩/٢/٥) لەمزگەوتی (جیهاد)دا خوێندوویەتەوەو، پاشان برای بەڕێزم کاك (ابراهیم فقێ رسول) ناسراو بە(عبدالباقی) ئەندامی شورای هێزی (ڕاپەڕین) لەکاسێتەوە هێناویەتە سەرکاغەزو، دوایی خۆشم پێیدا چوومەتەوەو چەند وشەو تەعبیرێکم دەستکاری کردوونو، هەندێك شتیشم لێزیادکردووە، جا وتاری ناو براوو ئەم نامیلکەیەی ئێستا لەم حەوت خاڵە پێك هاتوون:

١. گرنگیو بایەخ و پلەو پایەی مزگەوت.

٢. ئەرك (وظیفة)ی مزگەوت چییەو پێویستە چی تێدا ئەنجام بدرێ؟!

٣. ئادابی چوونە مزگەوتو هەڵسوکەوتی نێو مزگەوت.

٤. ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتو ئەمیەتو گرنگی پێدانی لەنێوان ساختەییو حەقیقەت دا.

٥. وێران کردنو تێکدانی مزگەتەکان چییەو چۆنە؟!

٦. مزگەوتەکان، ماڵەکانی خوا چۆن چۆنی بەرگرییان لێدەکرێو لەتێکدران دەپارێزرێن؟!

٧. مزگەوت لەسوننەتو سیرەی کردەیی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چیبووەو چۆن بووەو چیوچی تێداکراوە؟!

شتێکی ئاشکراشە کە ڕوونکردنەوەی پلەو پایەی مزگەوتو ئەرکی ئادابو ڕەوشتی هەڵسوکەوت تێداکردنیو... هتد لە حەوسەڵەی

وتارێك و نامیلكەیەكی ئاوادا نیە، بەڵام ئەو وتارو نامیلكەیە زیاتر وەڵامە بۆ پڕوپاگەندەو قسەوقاڵی ناحەزانی مزگەوت، كەدەیانەوێ حەقیقەتەكان لە خەڵكی مسوڵمانی كوردستان هەڵگێڕنەوەو بەدرۆو دەلەسەو سەفسەطە چەواشەیان بكەن و، زوڵم و دەستدرێژی یەك كەبەبیانووی جۆراوجۆرەوە لەمزگەوت و ئەهلی مزگەوتی دەكەن بەناوی (بەرگری كردن لەقودسیەتی مزگەوت) بەسەر خەڵكی دا ساقی بكەنەوەو، لەحاڵێك دا كە گەورەترین زوڵم و خراپەیان لەگەڵ دەكەن ــ كەزەوت كردنی ماڵی خواو دەستدرێژی كردنە سەر كەرامەت و حورمەتیەتی ــ بەپڕوپاگەندەی فریودەرانەوچەواشە كەرانەی خۆیان ئیخفاڵیان بكەن و وا داریان بكەن كە بەرگری یان بۆ لەمزگەوتەكان دەكەن، لەبەرانبەر ئیسلامی یەكان دا، ئەوانەی كەهەمیشە سەرگەرمی ئاوەدان كردنەوەی ماڵەكانی خوان بەعیبادەت و طاعەت!!

هەڵبەتە سوپاس و ستایشیش بۆ خوا خەڵك و جەماوەری مسوڵمانی كوردستانیش مەگەر بەدەگمەن ئەگەرنا ئەو قۆناغەی هەڵبڕیوە كەدۆست و دوژمنی خۆی و ئایینەكەی نەناسی و نەزانی كێن ئەوانەی ڕقیان لەماڵی خواو بەندە ڕەسەنەكانی خوایەو، چاویان پێیان هەڵنایەت و، هەوڵی ڕۆژو شەویان ئەوەیە كەماڵەكانی خوا وێران بكەن و لەجەوهەرو كاكڵ و نێوەڕۆك خاڵی یان بكەن و، ئەگەر نەشتوانن چوار دیوارە ڕواڵەتی یەكەشیان بڕوخێنن، ئەو رووح و گیانە زیندووەی كەبەوەوە بەمزگەوت و ماڵی خوا لەقەڵەم دەدرێن كەعیبادەت تێداكران و هەق تێدا گوتران و قورئان و سوننەت تێدا شەرح و تەفسیركران و خەڵك تێدا پەروەردەكرانە، بەهەر بڕوبیانوو و حیلەو حەواڵەیەك بووە ئەو رووحەیان لێ دەربهێنن و لەڕووی مەعنەوی یەوە تێكیان بدەن و وێرانیان بكەن! كەبێگومان وێران كردنی مەعنەوی لەهی ماددی و ڕواڵەتی

خراپتره، چونکه جەستەی بێڕووح هیچ نیەو بەمردوو دادەنرێ، هەر بۆیەش خوای پەروەردگارو تۆڵەستێن کەباسی تاوانی وێرانکردنی مزگەتەکان دەکات وێران کردنی مەعنەوی پێش هی ڕواڵەتی خستوە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ مَنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَنْ يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَا..﴾ (البقرة: ١١٤) واتە: وەکێ ستەمکارترە لە کەسێك کەناهێڵێ یادی خوا لەمزگەوتەکانی خوادا بکرێو هەوڵی وێران کردنیان دەدات؟!

هەروەها خەڵكو جەماوەری مسوڵمانی کوردستان دەشزانن کێن ئەوانەی کە بە بەندایەتیو طاعەتو زیکرو فیکرو چالاکیە جۆراوجۆرەکان بێگوێدانە هەڕەشەو گوڕەشەو زەبرو زەنگو گرتنو کوشتن سەرگەرمی ئاوەدان کردنەوەی ماڵەکانی خواو چاکترو زیاتر تێگەیاندنو پێگەیاندنی خۆیانو براو خوشکە موسڵمانەکانیانن.

بەهیوای ئەوەی ئەو ڕۆژەش دوور نەبێ کەنەك هەر مزگەوتەکان بەڵکو سەرجەم نێوەندو مەڵبەندەکانی ژیانو گوزەرانمان ببنە جێگای لەسەر شەکانەوەی ئاڵای حوکمو بەرنامەی خواو، سەرتاپای وڵاتو خاکی کوردەواریمان بکەینە پەرستگای خواپەرستیو مەیدانی دینداریمانو، دینمان کاڵایەك بێت پڕ بەبەژنو باڵای ژینمان.

# پێشەکی

**الحمدالله كما ينبغي لجلال وجهه وعظيم سلطانه والصلاة والسلام على رسول الله محمد أكرم خلقه وأعظم برهانه وآله اجمعين من الصحب والقرابة والتابعين لهم بأحسان الى يوم الدين.**

*خوێنەری بەڕێز:*

لای هەموو لایەك ڕوون و ئاشکرایە کەمسولمانان لەهەموو گۆشەو کەنارێکی جیهانی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامیشەوە دەستیان کردووە بە لەسەرخۆ لابردنی لێفەی خەوی درێژخایەن و هۆشیاری و بێداری و هەڵسان و ڕاپەڕین، جا هەرچەندە ئەو هۆشیار بوونەوەو هەستانەوەو ڕاپەڕینە لەزۆر شتدا خۆی دەنوێنێ، بەلام قەڵەباڵغ بوونی مزگەوتەکان و ئاوەدان کردنەوەیان بەزیکرو فیکرو طاعەت و عیبادەت و پەروەردە و فێربوون لەهەمووی زیاترو چاکتر بووژانەوەی ئیسلامی و هەڵسانەوەی مسولمانانی تێدا دەدرەوشێتەوە.

ئینجا بێگومان وەکو سوننەتێکی لەمێژینەی خوا هەر کات مسولمانانێك ویستبیان بەرنامەی خوا لەژیان و گوزەرانیان دا پیادە بکەنەوەو ولات و کۆمەڵگایان لەهەڵەو پەڵەو پیس و پۆخڵی ناشەرعی یەکان بژاربکەن و پاك بکەنەوە، لەلایەن کەسانێکەوە کەڕاوچی خراپن و بەبێ ئاوی لێڵ ڕاویان بۆ ناکرێ و، دز ئاسا لەتاریکی شەو دەرفەت وەردەگرن، کۆسپ و پەرچێك خراوەتە بەرێی و دژایەتی یان کراوەو گێچەڵیان بۆ سازکراوە.

ئێستاش دەبینین لەسەرتاسەری عالەمی ئیسلامیدا لەنێوان ئیسلامییەکان کەمزگەوت بەمەڵبەندو نێوەندی سەرەکی خۆیان دەزانن‌و، نا ئیسلامییەکان بەهەموو شێوەو جۆرەکانیانەوە کەبەر لەمزگەوت لەگەڵ خوای مزگەوت دا ناکۆکن‌و، پێش ماڵ ڕقیان لەخاوەن ماڵە، دژایەتی‌و کێشەیەکی توندو بێڕەزا لەسەر مزگەوتەکان هەیە!

جا لەهەمووشی سەیرتر ئەوەیە کەبرادەرانی عەلمانی‌و نائیسلامی بۆ جێ‌پێ لەق کردنی ئیسلامییەکان لەمزگەوتەکان دا بڕو بەهانەی عەجایب دێننەوە.وەك:

(مزگەوت جێگای خواپەرستی‌و عیبادەتە نەك حیزبایەتی‌و سیاسەت)!!

(نابێ مزگەوتەکان بکرێنە جێگای کێشەو ململانێی سیاسی)!!

جا نازانم ئایا ئەو برادەرانە هەر بەجددی نازانن کەدین‌و دەوڵەت‌و عیبادەت‌و سیاسەت‌و پەرستگەو فەرمانگە (المعبد والدائرة) لەئیسلام دا لەیەك جیانین‌و پێکەوە دژ نین، یاخود هەر خۆیان گێل دەکەن!!

بەهەر حاڵ من دڵسۆزانە ئامۆژگاری ئەو جۆرە کەسانە دەکەم کە بە چاویلکەی ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا سەرنجی ئیسلام ئەدەن‌و (قیاسی کەشکێ لەمەشکێ) ئەکەن، ئەگەر هەتا ئێستا بەجددی قەناعەتیان وابووە کەئیسلامیش وەك ئایینی شێوێنراوی نەصرانیەت دین‌و ژین‌و مزگەوت‌و بازاڕو عیبادەت‌و سیاسەت لەیەك دەپچڕێنێ‌و بگرە پێکەوە بەشەڕیان دەدات‌و بەگژ یەکتریان دادەکات، باقەناعەت هێنانی پێش بیرکردنەوە واز لێ‌بێنن‌و ئازادانە بەچاوی خۆیان سەرنج بدەن‌و بەعەقڵی خۆیان بیربکەنەوەو تەماشای قورئان‌و سوننەت بکەن، تاکو تێ‌بگەن کەهەتا ئێستا تێ‌نەگەیشتوون‌و حاڵی بن کەبە هەڵە حاڵی بوون!

وەئەگەر خوا نەکردە دەشزانن مەسەلەکە چۆنە، بەڵام هەر خۆیان گێل دەکەن، بۆ ئەوەی پاساوی زەوت کردنی مزگەوتەکان لەئەهلی ئیمان‌و

ئیسلام دەستەبەر بکەن و بەپێی یاسای چەوت و ستەمکارانەی: (ماڵ لەماڵخۆ حەرامە) ڕەفتار بکەن! ئەوە من دڵنیایان دەکەم کە مەیدانی درۆو ساختەو چەواشەکاری کورتەو پەتی زوڵمیش لەئەستووریدا دەپچڕێ.

ئایا کە ئیسلامییەکان لەم قۆناغەدا بەیاسای: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ لەگەڵ دوژمن و ناحەزانی خواو خۆیان ڕەفتارو هەڵس وکەوت دەکەن و، لەوان گەڕاون لەبارو مەیخانەو نادی و بلیاردخانەو ڤیدیۆ خانەکان دابنیشن و کۆببنەوەو سەرگەرمی یاری و گەمەو شتی پڕوپوچی خۆیان بن، نەك ویژدان و دادگەری بگرە تەنانەت دیموکراسیەتەکەی خۆشیان واداخواز ناکات کەئەوانیش واز لەئەهلی ئیمان و ئیسلام بێنن و بەئازادی بەبێ شەرت و مەرجی ناشەرعی‌یانەی فەرزکراو، خوای خۆیان لەمزگەوت دا بپەرستن و بەئەرك و چالاکی‌یە ئاسایی‌یە شەرعی‌یەکانی خۆیان هەڵسن، وەك قورئان خوێندن و دەرس گوتنەوەو فێرکردن و پەروەردەکردن و... هتد؟!

ئایا مزگەوت بەوە دەبێتە جێگای کێشەو مشتومڕو ململانێی سیاسی کەئەهلی مزگەوت ئازادانە ئەرك و چالاکی‌یەکانی نێو مزگەوت جێبەجێ بکەن، یان بەوە کەبرادەرانی عەلمانی لائیك کەلەشوێنە گشتی و تایبەتی‌یەکانی خۆیان دا ئازادن و هیچ کەس (مزاحم) یان نابێ، بێن تەنگیش بەئەهلی مزگەوت هەڵبچنن و تەنانەت لەماڵی خواش دا لەبەندەکانی خوا نەگەڕێن کەبەئازادی بیپەرستن؟!

بەڵێ ڕاستە مزگەوتەکان جێگای حیزبایەتی نین بەڵام بێگومان حیزبایەتی شەیطان و حیزبێك کەلەسەر بناغەی کوفرو شرك دامەزرابێت، ئەگەرنا حیزب و کۆمەڵی خواو (حزب الله) ئەوە مزگەوت مەڵبەندو کانگاو جێگای سروشتی خۆیەتی، چونکە هەر "کۆمەڵی خوا" لەماڵی خوا دوورەشێنەوە.

وەڕاستە مزگەوتەکان جێگای ململانـێی سیاسـی نین، بـەڵام جگـە لەبرادەرانی سێکۆلاریستو عەلمانی لەبەرگی ئاسایشو چەند بەرگێکی تردا، کێ دەچێ لەمزگەتـەکان دا یەخـە بەمسـوڵمانان بگـرێو جـەووی ئارامو ڕێزو حورمەتی مزگەتەکان بشێوێنێو بشکێنێ؟! ئایا هەر ئەوان نـین لـەماڵی خـوادا ململانـێ لەگـەڵ بـەندەکانی خـوادا دەکـەنو پاشـان سەرباری ئەمە دەیانەوێ بەناهەق تۆمەتباریشیان بکەن؟.

بەهەر حاڵ خوێنـەری بـەڕێزو خۆشەویسـت! پێشـتر سەرگوزشـتەی چۆنیەتی پەیدابوونی ئەم نامیلکەیەم خستەڕوو.

جا هیوادارم لـەخوای پـەروەدگارو دادگـەر داواکـارم کەئـەم وتـارە چ بەبیسـتراوی و بینراویو چ بەخوێنراوەیی بتوانـێ دەربـارەی پێناسـەی مزگەوتو گرنگیو پایەیو ئەرك (وظیفة)وکاری لەڕوانگـەی قورئـانو سوننەتەوە خاڵ لەسەر پیت دابنێو چیتر بەناهـەق گێچـەڵ بەئـەهلی مزگەوت نەکرێو شەڕیان پێنەفرۆشرێو ماڵ لەماڵخۆ حەرام نەکرێ.

بـەڵکو لـەجیاتی دروسـت کردنـی ئـەو کێشـەو هـەرا ناسروشـتیو لابەلایانە بۆ ئەهلی مزگـەوت، هـەموو ئەوانـەی خۆیـان بەمشـوورخۆرو دڵسۆزی کۆمـەڵگای کوردەواریمـان دەزانـن، هاوکـاری ئـەهلی مزگـەوت بکەنو دەسـتباریان بـۆ بگـرن، بەشـکم بەهـەوڵو هیمـەتی هەمووڵایـەك بتوانرێ ڕۆڵی شەرعیو سروشتی بۆ مزگەوتـەکان بگێڕنـەوە کە بریتیە لەدووبارە تێدا داڕشتنەوەو بنیات نانەوەی کەسایەتی نێرو مێو وردو درشتی ئەندامانی کۆمەڵگای کودەواریمان لەسەر بناغەی ئیمانو تەقواو ڕەوشتو ئادابە بەرزەکانی ئیسلامەتی.

بـەڵێ بـا مزگەوتـەکان بکەینـەوە مەڵبـەندو کانگـای تێگـەیاندنو پێگـەیاندنێکی ئیسـلامییانەی ڕاسـتو ڕەسـەن بـۆ سـەرلەبەری کۆمەڵگاکەمان، بەتایبەت وەچە (جیل)ی گەنجو تازە پێگەیشتوومان،

چونکە بێگومان بێگومان جیاوازی‌یەکی زۆر هەیە لەنێوان کوڕو کچانێک دا کەلەباوەشی ماڵی خوادا پێ‌دەگەیەنرێن‌و پەروەردە دەکرێن. وە کەسانێک کە بە شیری پیسی مەیخانەو باڕو چی‌و چی خانەکان فرچك دەدرێن‌و لەسێبەری شوومی کوفرو ڕەوشت نزمی‌و ئارەزوو پەرستی‌دا بار دەهێنرێن!! خوای زاناو پەنهان بینیش فەرموویەتی: ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا...﴾ (الاعراف/ ٥٨)

واتە: زەوی چاك‌و پاك‌و بەپیت‌و پیز بەفەرمانی پەروەردگاری ڕووەکی - سوود بەخشی - خۆی دەڕوێنێ، بەڵام زەوی پیس - شۆرەگ‌و بێ‌پیت - شتی‌بێ خێر نەبێ دەرناهێنێ!

ئیدی خوا یارمەتیمان بدات کەنەمامی کەسایەتی گەنج‌و لاوی گەلەکەمان لەزەوی پڕ خێرو بێری ماڵەکانی خوادا بنێژین، بۆئەوەی درەختی میوەدارو باغی بەرهەمدار یان لێ‌پێك بێت، کەبۆ خۆیان‌و بۆ گەل‌و وڵاتیشیان سوودبەخش‌و بەخێرو بێر بن، نەك خوانەکردە لەمەڵبەندو مۆڵگاکانی خراپەو ڕەوشت نزمی‌دا خراپە فێربن‌و، سەرەنجام عەیبداری ئێرەو گوناهباری ئەولابن‌و، خۆیان ڕوو زەردو شەرمەزارو کەس‌و کاریشیان لەسەریان قەرزدار ببنەوەو چاو بەرەو ژێربن.

١١ی ذوالقعدة ١٤١٩

١٩٩٩/٢/٢٨

هەڵەبجە

# سەرەتای وتارەکە

موسڵمانانی بەڕێزو خۆشەویست، برایان خوشکان!

لەوتاری ئەمڕۆمان دا باسی مزگەوت (المسجد) دەکەین، باسی ماڵیٚ خوا دەکەین. شتێکی ئاشکراو ڕوونە کەشوێن کەوتووانی هەر ڕێبازێكو پەیڕوانی هەر بەرنامەیەك بۆخۆیان لەهەموو کەس شایستەترن کە وشەو زاراوەکانی بەرنامەکەیان تەفسیرو مەعنا بکەن، بۆ وێنە؛ ئەهلی ئیمان لەخەڵکی دیکە باشتر دەزانن کە((ئیمان)) یانی چی؟ ((ئیسلام)) چی‌یە؟ پارێزکاری (تقوی) چۆنە؟! جیهاد چی دەگەیەنیٚ؟ فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە چی‌یە و چۆن دەکریٚ؟! دیارە ئەهلی ئیمانو ئەهلی مزگەوتیش لەهەموو کەس چاکتر دەزانن کەمزگەوت، ماڵی خوا چی‌یە و چۆنەو دەبیٚ چ ئەرکێکی تێدا ئەنجام بدریٚو چۆن ڕەفتاری لەگەڵ بکریٚ؟!!

هەروەك چۆن ئەگەر بمانەویٚ چاك لەماناو نێوەڕۆکی ئەو وشەو زاراوانە تیٚبگەین کە لە ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاواوە بۆمان هاتوونو ، لەو وڵاتانە سەریان هەڵداوەو خەڵکی ئەو وڵاتانە لەبەینی خۆیان دا لەسەریان ڕێك کەوتوون، وەك دیموکراسیەت، عەلمانیەت (سیکۆلاریزم)، لیبڕالیزم، ناسیۆنالیزم، سۆشیالیزم... هتد ئەوە پێویستە گویٚ بۆ ئەهلی ئەو وڵاتانە بگرین کەئەو جۆرە بیردۆزە و ڕێچکانەیان لەنێودا هەڵقوڵیونو خۆیان ئەو ناوانەیان لیٚناون، نەك بچین لەلای خۆمانەوە مەعناو چەمکێکی دیکەیان بۆ هەڵتاشین کەبێگومان ئەو ڕەفتارە بەگۆڕینیٚ (تحریف) لەقەڵەم دەدریٚ.

جا منیش وەك نوێژكەرێك و یەكێك لەئەهلی مزگەوت و یەكێك لە پەیڕەوانی ئیسلام لە ووتاری ئەمڕۆماندا هەوڵ دەدەم لەچەند خاڵێكی كورت دا باسی مزگەوتتان بۆ بكەم، چونكە لەم ڕۆژانە باسی مزگەوت و مزگەوتەكان بۆتە جێگای مشتومڕو وتووێژی نێوان خەڵكی: مزگەوت چی‌یە؟! كێ زیاتر هەقی بەمزگەوتەوە هەیە؟! ئەو چالاكی‌یانەی كەدەبێ لەمزگەوت دا ئەنجام بدرێن چی و چین؟! وەچی‌وچی نابێ لەمزگەوت دا بكرێ؟! ئەهلی مزگەوت كێن؟!... هتد، بۆئەوەی دەربارەی مزگەوت نوختە لەسەر پیت دابنێین و هیچ كەس دەرفەتی ئەوەی نەبێ كە بەناهەق لەئەهلی مزگەوت زیاتر خۆی بەخاوەنی مزگەوتەكان بزانی‌و، لەمسوڵمانان زیاتر خۆی بكات بەخاوەنی ئیسلام!! خوا پشتیوان بێ لەبەر تیشكی چەند ئایەتێكی قورئانی بەپیت و پێز چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەری بەڕێز (ﷺ) دا وەلامی هەركام لەو پرسیارانە دەدەینەوەو هەق و ناهەق لەیەك جیا دەكەینەوە، چونكە مەسەلەی مزگەوت و ماڵی خوا شتێكی هێندە گچكە نیە كە زاناو مامۆستایەك لەگۆشەی كتێبێك دا باسی‌كردبێ‌و بڕابێتەوە، بەڵكو مەسەلەیەكی هێندە گرنگە دەیان ئایەت و فەرمووده باسیان كردووەو ڕوونیان كردۆتەوە كە پلەو پایەی ماڵی خوا چۆنەو ئەمیەت و گرنگی چەندە؟ وەئەهلی مزگەوت كێن؟ وەئاداب و ڕەوشتەكانی هەڵس‌وكەوت لەگەڵ مزگەوت دا چین و چەندن؟ وە وێران كردنی مزگەوت چۆنە؟ وەچۆن چۆنی دەتوانرێ پارێزگاری لەماڵەكانی خوا بكرێ‌و لەوێران كردنی مادی‌و مەعنەوی بپارێزرێن؟!

# خاڵی یەکەم: گرنگی و بایەخ و پلەو پایەی مزگەوت

خوای پەروەردگار دەربارەی مزگەوتان، ماڵەکانی خۆی فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا﴾ (الجن: ١٨)

واتە: وە بێگومان مزگەوتەکان مڵکی خوان و دەجا لەگەڵ خوادا لەکەسی‌تر مەپاڕێنەوە ـ و کەسی‌تری لەگەڵ مەپەرستن ـ، شتێکی ڕوون و بەڵگە نەویستە ـ لەڕوانگەی ئیسلامەوە ـ کەهەموو شتێك موڵکی خوایەو خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو شتێك تەنها خوایە سبحانەو تعالی، جا لەم ئایەتەدا کەخوای پەروەردگار مزگەوتەکان بەموڵکی تایبەتی خۆی ناو دەبات بەرزی پلەو پایەی مزگەوتەکان و گرنگی و بایەخیان دەردەکەوێ، چونکە خوای باڵا دەست و خاوەنی هەموو کائینات لەنێو هەموو دروستکراوەکان (مخلوقات)ی‌دا مزگەوتەکان بەموڵکی تایبەتی خۆی دادەنێ کەبەشی کەسی دیکەیان پێوەنیە، پاشان دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا﴾ چونکە هیچ ماقوڵ نیە ئینسان لەماڵی ساغ و بێ خڵتەی کەسێکدا بێ و شتێك بکات و بەجۆرێك هەڵس‌وکەوت و ڕەفتار بکات کەپێچەوانەی ڕەزامەندی ئەو خاوەن ماڵە بێت! بەڵێ نابێ لەماڵی خوادا سەرپێچی و بێ‌فەرمانی خوا بکرێ و بەندایەتی بۆ غەیری خوا بکرێ و غەیری خوا بەناهەق و درۆ بکرێتە هاوەڵ و هاوبەشی خوا لەهەر بوارو لایەنێك لەبوارو لایەنەکانی بەندایەتی و پەرستن دا، کەپێشکەش کردنی دروشمەکان (تقديم الشعائر)و وەرگرتنی بەرنامەکان (أخذ الشرائع) هەموویان کۆدەکەنەوە، پاڕانەوە (دعاء)یش پێغەمبەر (ﷺ) بەکاکڵ و کرۆکی خواپەرستی داناوە (الدعاء مخ العبادة) رواه الترمذي عن انس، بەڵکو بەعەینی خواپەرستی و خودی بەندایەتی لەقەڵەمی داوە وەك فەرموویەتی: (الدعاء هو العبادة)

رواه مسلم والطبراني وابوداود والنسائي وابن ماجه والترمذي وقال: حسن صحيح.

کەواتە: (فلا تدعوا مع الله احداً) چ مەبەست پێی موتڵەقی خواپەرستی (عبادة) بێت وەك هەندێك لەتوێژەرەوانی قورئان فەرموویانە، چ مەبەست پاڕانەوەو لاڵانەوەو داواکردن بێت کەپێغەمبەر

(ﷺ) بەکاکڵ و جەوهەری خواپەرستی داناوە ئەوە سەرەنجام فەرق ناکات و خوای زاڵ و دادگەر فەرمانی بەبەندەکانی دەکات کەبەلای کەمەوە لەماڵی خۆیدا تەنها خۆی بپەرستریٚ و هاوەڵ و وێنەو هاوبەشی بۆ دانەنریٚ!

ئنجا با سەرنجی چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خواش (ﷺ) بدەین داخوا گرنگی و ڕێزو حورمەت و پلەو پایەی ماڵەکانی خوا چۆن باس دەکات:

١. (أحب البلاد الى الله تعالى مساجدها، وأبغض البلاد الى الله أسواقها) رواه مسلم وابن حبان، واتە: خۆشەویست ترین شوێن لەسەر زەوی لەلای خوا مزگەوتەکانن، وەبوغزێنراوترین شوێنیش لەلای خوا بازاڕەکانن.

٢. (مَنْ بَنَىٰ لِلّٰهِ مَسْجِداً بنىٰ الله لە بيتاً فى الجنـة) رواه البخاري ومسلم، واتە: هەر کەسێك مزگەوتێك بۆ خوا دروست بکات، خوا لەبەهەشت ماڵێکی بۆ بنیات دەنێ.

٣. (عن عائشة رضي اللّٰه عنها قالت: أَمَرَ رسولُ الله (ﷺ) بِبِنَاءِ المَسَاجِد فى الدُور وأَنْ تُنَظَّفَ وتُطَيَّبَ) اخرجه احمد وابوداود وابن ماجه والترمذي وصححه ابن حبان) واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بیّ دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کردووە بەدروستکردنی مزگەتەکان لەگەڕەکان دا، وەفەرمانی کردوە کەپاك و بۆنخۆش بکرێن.

وەك لەم فەرموودانەی پێغەمبەریش دا (ﷺ) دەبینین مزگەوتەکان لەسەر زەوی خۆشەویسترین شوێن و پارچە زەوین لەلای خوای تاك و پاك و، هەرکەسێك مزگەوتێك بۆخوا دروست بکات خوای بەخشەر بەبەخشینی کۆشك و تەلارێك لەبەهەشت پاداشتی دەداتەوەو، لەسەر مسوڵمانان پێویست کراوە کە لەهەر گوندو گەڕەك و کۆمەڵە ماڵێکدا مزگەوت دروست بکەن و پاك و خاوێنی ڕابگرن و بۆنخۆشی بکەن، کەبێگومان هەموو ئەمانەش بەهێزترین بەڵگەن بۆ ئیسپاتی بڵندی پایەو مەقامی ماڵەکانی خواو گرنگی و بایەخیان لەبەرنامەو شەریعەتی خوای دادگەردا، ئێستاش بابچینەسەر خاڵی دووەم و بزانین ئەرك (وظیفة)ی مزگەوت چی‌یە؟!

## خاڵی دووەم:
## ئەرکی مزگەوت چی‌یەو پێویستە چی تێدا ئەنجام بدرێ؟!

ئایا ڕاستە دەبێ تەنها نوێژەکان لەمزگەوت بکرێن‌و بە پەلەپەل دەرگا بکرێتەوەو دوای نوێژەکە دەرگا دابخرێت‌و یەڵڵا تەواو ئەرکی مزگەوت تەواو بوو! ئایا قورئان وای فەرمووە ؟! پێغەمبەر (ﷺ) وای فەرمووەو ئیسلام بەوە ڕازی‌یە؟! باسەرنج بدەین!

خەڵکێك کەبڕوایان بەئیسلام نیەو خۆیان بە نائیسلامی‌و بەعەلمانی پێناسە دەکەن زۆرجار توانج‌و پلار ئاڕاستەی ئیسلامی‌یەکان دەکەن کەئیسلامی‌یەکان ئەهلی مەنتیق‌و بەڵگە نین!! جائێمە لێرەدا بەپێچەوانەی بانگەشەو تۆمەتی ئەوانەوە بەبەڵگەو دەلیل دەیان دوێنین‌و دەڵێین:

ئایا برادەرینە مادام مزگەوت ماڵی خوابێت‌و بەدەقی قورئان بەشی غەیری خوای پێوە نەبێ ویژدان‌و دادگەری وا ناخوازێ‌و عەقڵ‌و مەنتیق واپێویست ناکات کەدەبێ ئەو ئەرکە لەمزگەوت دا ئەنجام بدرێ کەخاوەنی مزگەوت لەقورئان‌و کەلامی خۆی‌دا بۆی دیاری کردوە! نەك ئەوەی برادەرانی ئاسایش بۆی دیاری دەکەن، یان برادەرێك بەکەیفی خۆی بڵێ: بافلان و فیسار شت لەمزگەوت دا بکرێ، بەڵام فلان‌و فیسار شت نەکرێ؟!

کاتی خۆی ئێمە ڕەخنەو گلەیی زۆرمان لە ڕژێمی بەعس هەبوو، یەکێك لەو شتانە کەڕژێمی بەعس بەرانبەر بەگەلی کوردی ئێمە دەیکرد ئیهانەکردن بوو بەمزگەوتەکان‌وبەئەهلی مزگەوتەکان، کەنەیدەهێشت مزگەوت ئەرك‌و پەیامی خۆی جێ‌بەجێ بکات‌و بێگومان (ان في ذلك لعبرة لأولي الأبصار) دەبێ خەڵکی‌تر دەرس‌و پەند لەڕژێمی بەعس وەربگرن،

دەبینین چۆن ئەو ڕژێمە گەندەڵە لەسەر ئەو هەموو ستەمو دەستدرێژیو ئیهانەیەی کەبەرانبەر بە مسوڵمانانی کرد هەر لەمزگەوتەکانەوە بگرە هەتا ماڵو حاڵو ڕەزو باغو کاولکردنی خاکو نیشتمانیان، خوای دادگەرو تۆڵە ئەستێن چۆن کردنی بەپەندی زەمانە!!

*جا بزانین ئەرکی مزگەوت چییەو ئەهلی مزگەوتیش کێنو ئەرکو کاریان چییەو چۆنە؟!*

خوای زاناو میهرەبان لەسوورەتی (النور)دا ئەو ڕاستییانەمان بۆ ڕۆشن دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ * فِى بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ * رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ * لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ (النور: ٣٥ ـ ٣٨)

واتە: خوا ڕۆشنایی ئاسمانەکانو زەوییە، وێنەی ڕووناکییەکەی وەك تاقەیەکە کەچرایەکی تیدابێ، چرایەکە لەنێو شووشەیەك دابێ، شووشەکە دەڵێی ئەستێرەیەکی گەوهەر ئاسایە، سووتەمەنی چرایەکە لەدرەختێکی زەیتوونی بەپیتو پیرۆزەوەیە کە نە ڕۆژهەڵاتییەو نەڕۆژئاوایی ـ بەڵکو هەردووکیانە لەیەك کات دا ـ زەیتەکەی. هێندە ڕوونو بێخەوشە. خەریکە بێئەوەی ئاگری بگاتێ بنایسێ، ڕووناکی لەسەر ڕووناکییە، خوا هەرکەسێکی بوێ بەرەو ڕووناکی خۆی ڕێنوێنی دەکات، وەخوا وێنان بۆ خەڵکی دێنێتەوە. "تاکو حاڵی بن" وەبێگومان خوا بەهەموو شتێك زانایە. لەچەند ماڵێك دا "مەبەست مزگەوتەکانن"

کەخوا مۆڵەتی داوەو فەرمانی کردوە بەرز ڕابگیرێن و ناوی ئەویان تێدا بهێنرێ، پیاوانێك بەبەیانیان و ئێواران پاکی بۆ خوا ڕادەگەیەنن کەبازرگانی و مامەڵە لەیادی خواو نوێژ بەرپاکردن و زەکات دان بێئاگایان ناکات، لەڕۆژێك دەترسن کەدڵ و چاوەکانی تێدا هەڵدەگەڕێنەوە! ـ بۆیە ئەمانە دەکەن ـ تاکو خوا بەپێی باشترینی کردەوەکانیان پاداشتیان بداتەوەو لەچاکەو بەخششی خۆی بۆیان زیاد بکات وەخوا بەهەرکەسێکی حەز بکات بەبێ ژمارە ڕۆزی دەبەخشێ»

ئایەتی ژمارە (٣٦) یەکێکە لەو ئایەتانەی کە توێژەرەوانی قورئانی بەپیت و پێز زۆر لەبارەیەوە دواون و ئێمە لێرەدا مەودای ئەوەمان نیە هەقی خۆی بدەینێ، ئەوەندە هەیە ڕستەی یەکەمی بەچەند جۆرێ تەفسیرکراوە کەگرنگترینیان ئەمانەن:

١. خوا مایەی ڕۆشنایی ئاسمانەکان و زەوی یە، واتە بەدیهێنەریانەو ڕۆشن کەرەوەیانە بەڕووناکی بوون (نور الوجود).

٢. خوا ڕۆشن کەرەوەی ئاسمانەکان و زەوی یە بەهۆی ئەستێرەو خڕۆکەکانەوە.

٣. خوا هیدایەتدەرو ڕێ پێشاندەری ئاسمانەکان و زەوی و دانیشتووانیانە لەمرۆڤ و فریشتەو جن.

٤. خوا مشوورخۆرو سەرپەرشت و هەڵسوڕێنەری کاروباری ئاسمانەکان و زەوی یە.

دیارە جێی سەرنج و تێوەڕامانیشە کەخوای کاربەجێ پاش خستنەڕووی ئەو ڕاستی یە کەئەو ڕۆشنایی ئاسمانەکان و زەوی یە، یەکسەر باسی مزگەوتەکان، ماڵەکانی خۆی کردوە تاکو بزانین کە هەر کەسێك عەودالی ڕووناکی و هیدایەتی خوابێت دەبێ لەماڵی خوا (مزگەوت)دا بۆی بگەڕێ!!

ئنجا لەئایەتی ژمارە (٣٧و ٣٨)دا دەربارەی ئەرکیماڵەکانی خواو ئەوانەی کەماڵەکانی خوا بەرزو پاك ڕادەگرن ئەم ڕاستییانە هەڵدەهێنجرێن:

١. پێویستە ماڵەکانی خوا لەڕووی مەعنەوی‌و ماددییەوە پاك‌و بەرز ڕابگیرێن (فِي بيوت أذن الله أن ترفع) چونکە تویژەرەوانی قورئان دەڵێن وشەی (ترفع) بەرز ڕاگرتنی ماددی‌و مەعنەوی دەگرێتەوە، جا لەبەرئەوەی ئێمە لەخاڵی سێیەمدا باسی چۆنیەتی بەرزو پاك ڕاگرتنی ماڵەکانی خوا دەکەین لەڕووی ڕواڵەتی‌و مادییەوە ئەو باسە بۆئەوێ هەڵدەگرین، بەڵام تیشکێك دەخەینە سەر چۆنیەتی پاك‌و بەرز ڕاگرتنی مزگەوتەکان لەڕووی مەعنەوییەوە:

وەك لەخاڵی یەکەم دا خستمانە ڕوو کەشتێکی یەکجار ناقۆڵاو ناماقووڵە کەئینسان لەحاڵێك کەلەماڵی یەکێك دایە کاری وابکات کەمایەی تووڕەبوون‌و نارەزاییبێت، کەواتە بەرزو پاك ڕاگرتنی ماڵەکانی خوا لەڕووی مەعنەوییەوە بەوە دەبێ کەبەهیچ جۆرێك هیچ گوناح‌و خراپەو بێشەرعییەکیان تێدانەکرێ، بەتایبەت گوناح‌و تاوانی هەرەزلی هاوبەشی بۆ خوادانان (الأشراك بالله) کەگەورەترین تاوانەو ڕەحمەت‌و بەخشندەیی بێسنووری خوای میهرەبانیش نایگرێتەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ..﴾ (النساء: ٤٨)

دیارە شیرکیش تەنیا سوجدەو ڕکووع بۆ غەیری خوا بردن نیە، بەڵکو نزاو پاڕانەوەش لەغەیری خوا شیرکەو، بەپەسەند دانانی غەیری بەرنامەو حوکمی خواش شیرکەو بەکورتی بەهەر شێوەیەك لەشێوەکان غەیری خوا ببرێتە ڕیزی خواوەو وەك خوا سەیر بکرێ شیرکەو شیرکی گەورەشە، شیرکی گەورەش ئینسانی پێ لەبازنەی ئایینی خوا دەردەچێ، وەلەڕاستیدا هاوبەشی بۆ خوا دانانیش وەك چۆن

گـەورەترین تاوانـە بنـكو ڕیشـەی زۆربـەی هـەرە زۆری تـاوانو سەرپێچییەكانیشە، هەروەك چۆن خوا بە یەكگرتن (التوحيد) چاكترین چاكەیەو بناغەی هەموو چاكەو خەسڵەتە پەسەندەكانیشە.

٢. دەبێ ماڵـەكانی خـوا كانگـاو مەڵبـەندی زیكـرو یـادی خوابـنو هەمیشە بـەیادو باسـی خـوا ئـاوەدان بن (ويذكـر فيـها اسمـه)، دیـارە مەبەستیش لەزیكرو یادی خوا بەس ئەوە نیە كەبگوترێ (یاالله) یان (الله الله)، بەڵكو وەك توێژەرەوانـی قورئان فەرموویانـە هەرشتێك پـەیوەندی بەخواوە هـەبێ دەچێتە بازنەی (زیكـر)ی خـواوە، وەك: باسـی حـەڵاڵو حـەرام، بەهەشـتو دۆزەخ، ڕەوشـتو ئـادابی بـەرزو جـوان، تەفسـیری قورئان، لێكدانەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )، نوێژكـردن، قورئان خوێندن... هتد.

٣. پێویسـتە ماڵـەكانی خـوا هەمیشـە و دایـم بەشـەوو ڕۆژ، ڕۆژ تائێوارەو شەو تابەیانی خوایان تێدا بەپاك بگیرێو سوپاسو ستایش بكرێ (يسبح لـه فيها بالغدو والاصال)، دیارە بەپاكگرتنی خوای پاكو بێگـەردیش جل جلالـە هـەم بـەپاكو بێلەكـە دانـانی خـۆی . زاتـیو سیفەتەكانیو ناوەكانی . و، هەم بەچاكوپاك دانانی فەرمایشتەكانیو، هەم بەبێ هەڵەو پەڵە زانینی یاساو دەستوورەكانیو، هـەم بەدادگەرانەو ڕاست زانینی قەدەرو بڕیارەكانیو هەم بەپارێزراو (معصوم)وتێرو تەواو دانانی پێغەمبـەرەكانی ( ﷺ)و... هتـد دەگرێـتەوە، كەواتـە ئەوانـەی بەلای خۆیانەوە ئەهلی زیكـرو فیكرن بەڵام زمانیان لەبەندە پارێزكـارو فیداكارەكانی خـوا كردۆتە درێشەو بەخراپـە باسـیان دەكـەنو لەپشـت پـەردەی تلـخ ڕەشـەوە سـەیریان دەكـەنو تۆمـەتی خراپیـان بـۆ هەڵدەبەسـتنو بوختانیـان بـۆ دەكـەن، بـەوەی دەیكـەن ئـەوەی دەیڵێـن

هەڵدەوەشێتەوە، چونکە ئەوەی خوای خۆش بوێ دەبێ دۆستەکانیشی بوێ!!

ئینجا شایانی باسە کەوشەی (بالغدوِّ والآصال) توێژەرەوانی قورئان بەدووجۆر مانایان کردوە: یەکەم: واتە: بەیانیان‌و ئێواران یادی خوا دەکەن‌و بەپاکی دەگرن‌و ستایشی دەکەن، دووەم: لەبەیانی‌یەوە هەتا ئێوارەو لەئێوراەوە هەتا بەیانی واتە ڕۆژو شەو بێ‌پسانەوە یادی خوا دەکەن، جائەگەر مەعنای یەکەمیان بگرین ئەوە مەبەست سەرنج ڕاکێشانی بەندە خواپەرستەکانە بۆ گرنگی‌و کاریگەری ئەو دووکاتە (بەرەبەیان‌و دەمەو ئێوارە)، وەئەگەر هی دووەمیان بگرین، ئەوە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کەنابێ ماڵەکانی خوا هیچ کاتێکی شەوو ڕۆژ قەدەغە بکرێن‌و (حجن)یان لەسەربێ بۆ ئەهلی طاعەت‌و عیبادەت‌و زیکرو فیکرو، پێویستە هەمیشە دەرگاکانیان ئاوەڵاو کراوەبن‌و هیچ کاتێك لەڕووی بەندەکانی خوادا پێوەنەدرێن‌و دانەخرێن، مەگەر لەوکات‌و بارودۆخە تایبەتی‌یانەدا کەحیکمەت‌و بەرژەوەندی‌یەکی شەرعی داخوازی بکات‌و ئەهلی مزگەوت خۆیان بەپێویستی بزانن کەواتە هەرکەسێك بەبێ پاساو (مبرر)ی شەرعی ماڵەکانی خوا لەبەندەکانی مەنع‌و قەدەغە بکات، ئەوە باهەموولایەك بزانن کەدوژمنی خواو ماڵی خواو بەندەکانی خوایەو، نابێ هیچ کەس بەدەمامکی سەر ڕووی ساختەچی‌یانەی فریو بخوات‌و لەخشتەبچێ.

٤. ئەهلی مزگەوت‌و ئەوانەش کەشایستەی ئەوەن ماڵەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە کەڵەپیاوانێکن کە دونیاو دواڕۆژو مزگەوت‌و بازاڕو دوانگە (منبر)و فەرمانگە (دائرة)و عبادەت‌و سیاسەت‌و طاعەت‌و کەسابەت پێکەوەو وێکڕا دەبینن، هەرشتە لەشوێنی شیاوی خۆی‌دا دادەنێن‌و، هیچ شتێك لەسەر حیسابی شتێکی‌تر گەورە ناکەن‌و هیچ

کـارێکیش بۆیـەکی‌تر فـەرامۆش ناکـەن، بـەژیان‌و گوزەرانـی دنیـاوە سەرقاڵن، بەڵام دنیایان وەك وەسیلە گرتوەو بازرگانی‌و کڕین‌و فرۆشتن‌و کەسابەت لـەیادی خـواو نوێژکـردن‌و زەکـات دان بـێ ئاگایـان ناکـات‌و، وایـان لێ‌ناکـات کەلەبـەر ژیـن ئاگایـان لـەدین نـەمێنێ، هـەروەك چـۆن بەبیانووی خواپەرستی‌و دینداریشەوە، واناکەن ئاگایان لەخەڵك‌و دنیا نەمێنێ‌و مەیدانی سیاسەت‌و کەسابەت بۆ ئەهلی کوفرو نیفـاق چـۆڵ ناکەن کەخۆیان تێیدا تاقە سوارە بن‌و کلکی تێـدا ڕاوەشێنن! (رجـال لاتلهیهم تجارة ولابیع عن ذکر الله واقام الصلاة وایتاء الزکاة...)، ئنجا ئەو کەڵە پیاوانە کەئاوا بەهاوسـەنگی بەرنامـەی خوایـان گرتـوەو بـەو دینداری‌یە ڕاست‌و تـەواوە مـاڵی خوایان ئاوەدان کردۆتەوەو کاڵای پڕ بەباڵای ئایینی خوایان بەبەرباڵای ژینـی خۆیـان دا کـردوە، وەنـەبێ بـەو خواپەرستی‌و مسوڵمانەتی‌یەیان لەخۆیان بایی‌بووبن‌و لەکەوڵی خۆیـان دەرچووبن (یخافون یوما تتقلب فیە القلوب والابصـار) بەڵکو دڵیان پڕە لەسام‌و هەیبـەتی ئـەو ڕۆژە سـەخت‌و دژوارەی کەلـەترس‌و حەژمـەتان خەڵکی چاوو دڵیان لەشوێنی خۆیان دا ناحەجمن‌و هەڵدەگەڕێنەوە!!

جا بێگومان کەسانێکی ئەوتۆش شایستەی ئەوەن کەخوای دادگەرو بەخشەر چاکترین پاداشتیان بداتـەوەو لەبەخشش‌و لوتفی بێ‌سنووری خۆی بۆشیان زیاد بکات (لیجزیهم الله احسن مـاعملوا ویزیدهـم مـن فضلـهم والله یرزق من یشاء بغیر حساب).

**خوشك‌و برا مسوڵمانەکان!**

لەم سێ ئایەتەی سوورەتی (النور)دا کە ڕابردن بۆمان ڕوون بۆوە کە ماڵەکانی خوا ئەرکیان چی‌یەو دەبێ چی‌یان تێدا ئەنجام بدرێ، هەروەها زانیمـان کەئەهلی مزگەوت کێن‌و چۆنن! ئەهلی مزگەوت بەپێچەوانـەی تێگەیشتن‌و بۆچوونـی زۆر کەسـەوە ئەوانـە نیـن کەنـەزانن لەمـەیدانی

حوکمو سیاسەتو کارو کەسایەت دا چ باسەو کێ پادشایەو کێ کوێخایە! عابیدی بەڕاستی دەبێ سیاسی بێ، نوێژکەری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کەبزانێ لەدنیادا چ باسەو کێ دۆستەو کێ دوژمنە، وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (کلکم راع وکلکم مسؤل عن رعیة) رواه مسلم، واتە: هەرکامێکتان شوانو چاودێرەو بەرپرسیارە لەڕاست کۆمەڵگاکەیدا.

کەواتە: ئەوانەی خەیاڵیان وایەو پێیان وایە کەهەتا لەدونیاو سەرقاڵییەکانی دنیا دوورتربن لەخوا نزیکتردەبنو لەلای خوا چاکتر دەبن، بادڵنیابن کەبەهەڵەدا چوون، چونکە سەنگی مەحەکی نزیکی لەخواو پەسەندی لەلای خوا، پابەندییە بەشەریعەتی خواوە لەهەموو بوارو لایەنەکانی ژیانو گوزەرانی تاکیو کۆمەڵایەتیدا، دیارە ئیسلامیش لەسۆنگەی ئەوەوە کەبەرنامەیەکی هەمەلایەنەی ژیانو گوزەرانە ناکرێو ناگونجێ بەکەسانێك لەواقیعی ژیان دا بچەسپێو بەڕێوە بچێ کە لەدنیا بێ هەواڵو سادەو فەقیر حاڵو ڕووتو ڕەجاڵو دەست بەتاڵ بن، پاشان ئەوە ئازایەتیو هونەر نیە کەبابایەکی گۆشەگیرو دوورە پەرێزو داماوو فەقیر هەمیشە خوای لەیادبێتو لەبیری نەچێ! بەڵکو هونەرو ئازایەتی ئەوەیە کەسەرگەرمی بازرگانیو مامەڵە یان سیاسەتو مشوورخواردنی کاروباری خەڵكو وڵات بێو لەخوا بێئاگا نەبێو لەڕێبازی شەرع لانەدەی، پێشتریش باسمان کرد کەیادی خوا (ذکر الله) بەس جۆرو شێوەیەکی تایبەتی نیە وەك گوتنی (سبحان الله)و(الحمدلله)و(الله اکبر)و(لا اله الا الله)، ... هتد بەڵکو هەرشتێك باس بکرێ کەجێگای ڕەزامەندی خوابێو بەپێی شەرعو لەسنووری شەرع دا بێت ئەوە بە زیکر حیسابە، وەك زاناو پێشەوایانمان فەرموویانە.

# خاڵی سێیەم:
# ئادابی چوونە مزگەوتو هەڵس وکەوتی نێو مزگەوت

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿یابنی آدم خذوا زینتکم عند کل مسجد...﴾ (الاعراف: ٣١) واتە: ئەی وەچەی ئادەم! لەلای هەر مزگەوتێك خۆتان برازێننەوە.

دیارە لێرەدا ڕازاندنەوە (التزین) موتڵەقەو دەرو دەروون (الظاهر والباطن) دەگرێتەوە، جاڕازاندنەوەی دڵو دەروون بەوە دەبێ کەئینسان خوا بەیەکگر (مُوَحِّدْ) بێتو جگە لەخوا هیچ کەسو شتێکی دیکە بە بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوو فەرمانڕەوای خۆی نەزانێ، نەلە پەروەردگارێتی (الربوبیة)و نەلە پەرستراوێتی (الألوهیة)و نەلە ناوو سیفەتەکانی‌دا هاوبەشو هاوتا بۆخوای تاكو پاك دانەنێ، وە پێغەمبەری خوا ـ محمد ـ (ﷺ) بەتاکە ڕابەرو سەرمەشقی خۆی دابنێو، بەس ئیسلامیش بە بەرنامەو ڕێبازی خۆی هەڵبژێرێو بەکورتی دەروونی خۆی بەبڕواو پارێزکاری (الایمان والتقوی) بڕازێنێتەوەو، ڕواڵەتو دەرەوەی خۆشی بەبەرگو پۆشاکی حەلاڵ و شەرعی پاك برازێنێتەوە خۆ دوور بگرێ لەجل‌وبەرگی پیسو لەبۆنی ناخۆش، تەنانەت نوێژی بەکۆمەڵ کەبەبیستو حەوت یان بیستو پێنج پلە لەنوێژی بەتەنیا چاکترو بەرزترە وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (صلاة الجماعة أفضل من صلاة الفذ بسبع وعشرین درجة) متفق علیه، کەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرکەسێك شتێکی بۆن ناخۆشی وەك تووروو سیرو پیوازی خواردبێ لێی قەدەغە کردوە کەبێتە مزگەوت!

(مَنْ أکل الثوم والبصل والکراث فلا یقربن مسجدنا، فان الملائکة تتأذی مما یتأذی منە بنو آدم) متفق علیه.

واتــە: هەرکەسـێك سـیرو پیــوازو کــەوەری خــوارد بــا نــیزیکی مزگەوتەکـەمان نەکـەوێ، چونکـە فریشـتەکانیش بـەوە ناڕەحـەت دەبـن کەوەچەی ئادەم پێی ناڕەحەت دەبن!![1]

سەرنج بدەن! ئەگەر بابای نوێژکەر بیست‌و شەش یاخود بیسـت‌و چوار پلەی خێرو پاداشتی نوێژە بەکۆمەڵەکەی لەکیس خۆی بدات، بەڵام بەهۆی بۆنی ناخۆشی زاری‌یەوە مسوڵمانان‌و فریشتەکان ئازار نـەدات ئێستا هەر قازانجیەتی! کەواتە ئازار دانی مسوڵمانان تاوانێکی هێنـدە زلـە تەنانـەت بـەبۆنی ناخۆشـی دەم‌و ددان چ جـای بەقسـەو قسـەڵۆکی ناخۆش‌و بەتۆمەت‌و بوختان‌و غەیبەت‌و بەرگری کردن لەناهەق!!

بەڵێ تەنیا کاتێك ئینسان شایسـتەی چوونـە مـاڵی خوایـە کـەدەرو دەروون (ظاهروباطن)ی خۆی بەوشێوەیە کەباسمان کـرد ڕازاندبێتـەوە کەواتـە ئەوانـەی کـەزۆر بەشـپرزەیی‌و شـەپڕێوی‌و بێسـەروبەری دێنـە مزگەوت، کەبەو حاڵە پێیان عەیبە بچنـە مـاڵی هەرکەسێك!بەبیانووی ئەوەی کـەماڵی خـوا جێگـای خـۆ بەکـەمگرتن (تواضـع)و خاکی‌یـەتی‌و بەندایەتی‌یە، بەهەڵەدا چوون، چونکە بەڵێ مزگەوت جێگای بەندایەتی‌و سـادەیی‌و خـاکی بوونـە بـەڵام بـەو مەعنایـە نـا کەئینسـان شـپرزو بێسەلیقەو کەمتەرخەم بێـت! هەربۆیـەش یـەکێك لـەزاناو پێشـەوایانی پێشینی چاکمان فەرموویەتی: (من لەکاتێك دا دەچمە مزگەوت‌و ماڵی خوا باشترین جل‌وبەرگم لەبەر دەکەم‌و خۆم دەڕازێنمەوەو خۆم بۆنخۆش دەکەم).

ئینجا باهەندێك لـەئاداب‌و ڕەوشتە گرنگـەکانی چوونـە مزگـەوت و هەڵس‌و کەوتی نێو مزگەوت هەر بەکورتی باس بکەین:

---

[1] دیارە وەك زانایان فەرموویانە مەرج نیە تەنها ئەو جـۆرە خواردنانـە ڕێگـر (مـانع)ی چوونـە مزگەوت بن بەڵکو هـەر خـواردن‌و خۆراکێکـی دیکـەش کـەبۆنی دەم‌و ددان نـاخۆش بکـات‌و مسوڵمانان بێزارو ناڕەحەت بکات هەمان جۆرە حوکمی هەیە. بڕوانە (الطب النبوی) ابن قیم الجوزیة، ص ٢٩٤.

١ـ نیەت هێنان و دڵی خۆساغ و ساف کردنـــەوە بـەر لەهـەنگاونان بـەرەو مزگەوت، چونکە (انما الأعمال بالنیات وانما لکل امرئ مانوی..) متفق علیه.
هەموو کاروکردەوەیەکی شەرعی و پەسەند دەگرێتەوە.

٢. لەکاتی چوونە ژووری مزگەوت دا لاقی ڕاستی پێش بخات، چونکە پێش خستنی پێ‌ی ڕاست بۆ هەر کارێکی پەسەند سوننەتە، پاشان ئەم دووعایە بخوێنێ کە(عبدالله بن عمرو بن العاص) خـوا لێـی ڕازی‌بـێ لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) گێڕاویەتەوە: (أعوذ بالله العظیم وبوجهه الکریم وسلطانه القدیم من الشیطان الرجیم) رواه البخاری، واتە: پەنا دەبەمە بەرخوای مەزن و ڕووی بەخشندەی و دەستەڵاتی لەمێژینـەی لەچەنگ شـەیطانی نەفرین لێکراو.

دەشتوانێ لەجیاتی ئەو دووعایە یان وێڕای ئەم دووعایەش بخوێنێ: (اللهم افتح لی أبواب رحمتك) رواه مسلم، واتە: ئەی خوایە دەروازەکانی ڕەحمەتی خۆتم بۆ ئاوەڵابکە، لەکاتی چوونـە دەرەوەش دا لاقـی چـەپ پێش بخات و بڵێ: (اللهم افتح لي ابواب فضلك) رواه مسلم، واتە: ئەی خوایە دەروازەکانی بەخششی خۆتم بۆبکەوە.

وەدەشتوانێ لەجیاتی ئەو دووعایانە بەتایبەت هـی دووەمیـان یـان وێڕای ئەوان ئەم دووعایە بڵێ کەلەم فەرموودەیەدا هاتوە: (اذا دخل أحدکم المسجد فلیسلم علی النبي ﷺ ولیقل: اللهم افتح لي ابواب رحمتك، واذا خرج فلیسلم علی النبي (ﷺ) ولیقل: اللهم اعصمني من الشیطان الرجیم) رواه ابوداود عن ابي هریرة. واتـە: هـەرکات یەکێکتان چووە مزگەوت باسـەلام[٢] لەپێغەمبەر (ﷺ) بکات، پاشان بڵێ: ئەی خوایە دەرگاکانی ڕەحمەتم لێ بکەوە، وەهەرکات چووە دەر باسەلام لەپێغەمبەر ( ﷺ) بکـات و دوایـی بڵێ: ئەی خوایە لەشەیطانی نەفرین کراو چەپاڵەم بدە.

٣. پارێزگاری کردنی حورمـەت و ڕێـزی مزگـەوت بـەهۆی پاراسـتنی ئارامی (هدۆ)و دەنگ بەرزنەکرنەوەوغەڵبە غەڵب نەکردن و مەنع کردنی

---

[٢] بڵێت: (السلام علی رسول الله) یان (الصلاة والسلام علی رسول الله محمد وآله)یان هەر صیغەیەکی دیکە کەمەبەست بگەیەنێ.

منداڵی زۆر گچکە کەپاك‌و خاوێنی نازانیٚ‌و ئینسانی شێت، وەکڕین‌و فرۆشتن‌و سەوداو بازرگانی نەکردن لەمزگەوت دا، وە بۆنخۆش کردنی بەتایبەت لەڕۆژانی جومعەدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەوە ئەم فەرموودەیەی لیٚ‌گێڕراوەتەوە:

(جَنِّبوا المساجدَ صِبْيانَكُمْ ومَجانينَكم، وشِرائكُمْ وبيعكُمْ، وخُصوماتِكُمْ ورفعَ أصواتِكُمْ، واقامةَ حدودِكُمْ وسَلَّ سَيفِكُمْ، واتخذوا على أبوابِها المطاهِرَ وجَمِّروها في الجُمَعِ) رواه ابن ماجه وغيره وفي اسناده ضعف.

واتە: منداڵەکانتان‌و شێتەکانتان لەمزگەتەکان دووربخەنەوە، هەروەها کڕین‌و فرۆشتنتان، وەدەمەقاڵیٚ‌و دەنگ بەرزکردنەوەتان، وەجیٚ‌بەجیٚ‌کردنی سزا شەرعی‌یەکان‌و شمشێر هەڵکێشانتان، وەباشوێنی تارەت‌و دەستنوێژ لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکان بن وەڕۆژانی جومعە بۆنخۆشیان بکەن.

جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەکابرایەکی گوت کەبەدەنگی بەرز هاواری دەکردو لەحوشترێك دەگەڕا: (لاوَجَدْتَ إنما بُنِيَتِ المساجدُ لِما بُنِيَتْ لَهُ) رواه مسلم، واتە: یاخوا نەیدۆزیەوە! بێگومان مزگەوتەکان بەس بۆ ئەوە دەشێن کەبۆی بنیات نراون "کەبەندایەتی‌و طاعەت‌و یادی خوایە".

هەروەها (بخاري) ڕەحمەتی خوای لیٚ‌بیٚ لە(سائب بن زيد الكندي) خوا لێی ڕازی‌بیٚ دەگێڕێتەوە؛ دەڵیٚ: لەمزگەوتیٚ ڕاوەستابووم پیاوێك دەنکە چەوێکی تیٚ‌گرتم، سەرنجم دا عومەری کوڕی خەتتاب بوو. خوالێی ڕازی‌بیٚ. فەرمووی: بچۆ ئەو دوو نەفەرەم بۆ بێنە، منیش دووکەسەکەم هێنانە لای، فەرمووی: ئێوە کێن؟! گوتیان: خەڵکی (طائيف)ین، فەرمووی ئەگەر خەڵکی ئێرە بوونایە ئازارم دەدان، لەمزگەوتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەنگتان بەرزدەکەنەوە؟!

٤. پاك‌و خاوێن‌و بۆنخۆش ڕاگرتنی مزگەوت‌و دوورخستنەوەی هەرشتێك کەببێتە مایەی پیس‌و پۆخەڵ بوون‌و تێکچوونی بۆن‌و

جەووی مزگەوت، وەك بۆنی ناخۆش‌و شتی پیس‌و تف‌و چڵم‌و بەڵغەم ڕۆكردن‌و.. هتد. ئەمەش چەند فەرموودەیەك لەوبارەوە:

(البصاقُ في المَسْجِدِ خَطيئةٌ وكَفّارَتُها دَفْنُها) متفق علیه عن انس. واتە: تف ڕۆكردن لەمزگەوت گوناحەو لابردنی دەبێتە مایەی سڕینەوەی ئەو گوناحە. هەروەها (انس) خوا لێی‌ڕازی‌بێ دەگێڕێتەوە كەجارێكیان پێغەمبەر (ﷺ) بەڵغەم (نخامە)یێكی بەسەقفی مزگەوتەوە بینی، تووڕە بوو هەتا ڕووی سوور هەڵگەڕا، پاشان ئافرەتێك لەئەنصاری‌یەكان هەستا كڕاندی‌و بۆنی خۆشی لەشوێنەكەی‌دا، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: (ما احسن هذا!) ئەم كارە شتێكی چەند چاكە!! ئەم فەرموودەیە (نسائي)و (ابن ماجە) گێڕاویانەتەوە.[٢]

دیارەئەو بەسەرهاتەش زۆر باوە كەڕۆژێكیان پێغەمبەر (ﷺ) لەمزگەوت بوو كەكابرایەكی دەشتەكی (أعرابی) هاتە مزگەوت‌و میزی كردو هەندێك لەهاوەڵان (اصحاب) خوا لێیان ڕازی بێ ویستیان ئازاری بدەن، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) نەیهێشت‌و فەرمووی میزەكەی پێ‌مەبڕن (لاتُزرِموا علیهِ بَوْلَهُ) پاشان بانگی كردن‌و پێی فەرموون: (ان المساجد لم تبن لهذا انما لذكر الله والصلاة فیها) رواه البخاري، واتە: مزگەوتەكان بۆ ئەوە دروست نەكراون، بەڵكو تەنها بۆ یادی‌خواو نوێژ تێداكردن بنیات نراون.

دیارە بەقیاس لەسەر ئەم فەرموودانە هەرجۆرە ڕەفتارێكی دیكەش كە لەگەڵ ڕێزو حورمەتی ماڵی خوا نەگونجێ یان ببێتە هۆی پیس‌و پۆخەڵ بوونی دروست نیەو قەدەغەیە، بۆ وێنە: سەرتاشین، سمێڵ‌و ڕیش كورت كردنەوەو چاككردن، نینۆك كردن، وەفڕێ‌دانی هەر شتێك لەمزگەوت تەنانەت پارچە قاقەزێكیش!

---

[٢] بروانە: (الآداب الشرعیة) ج٤ ص ٢٥ - ٢٦، الامام الفقیە المحدث ابی عبدالله محمد بن مفلح المقدسي.

خواش بەلوتفو کەرەمی خۆی هیدایەتی هەموولایەکمان بدات کەهەموو ئادابە ڕواڵەتیو مەعنەوییەکانی هاموشۆو هەڵسوکەوتی نێو ماڵەکانی خوا ڕەچاو بکەینو خۆمان لەپێچەوانەی ئەدەب بپارێزین، بەتایبەت لەدەمەقاڵێو مشتومڕی بێجێ لەسەر چۆنیەتی وتاردان دەرسو دەورخوێندن کەبەداخەوە زۆر جاران لەئەنجامی هەڵسوکەوتی ناشەرعییانەی هەندێك مسوڵمانی فام کاڵو کرچو کاڵ ناحەزانی خواو مزگەوت بیانووی زیاتر دژایەتی کردنی مسوڵمانانیان بەهۆی داخستنو دەرسو وتار لێمەنع کردنی مزگەوتەکانیان کەوتۆتە دەستو، ئەوان کەهەر لەنەبوو درۆو بوختان بۆ ئەهلی مزگەوت هەڵدەبەستن، بەدیتنی ئەو جۆرە ڕەفتارانە مێش لەئیسلامییەکان دەکەنە گامێشو لێیان دەکەنە هەڵلا، پاشان لەلای خەڵکی عەوامو سادەش خۆیان پیاو چاك دەکەنو وایان ئیخفال دەکەن کەبۆیە مزگەوتەکان دادەخەنو وتارو دەرسین تێدا مەنع دەکەن بۆئەوەی ڕێزو حورمەتیان پارێزراو بێتو هەراو مشتومڕیان تێدا نەکرێ!!

بۆیە دەتوانین بڵێین هەر کەسێك ئەوجۆرە هەڵسوکەوتو ڕەفتارە هەڵەو ناشەرعییانەی لێبپێشکوونەوە، ئەوە بزانێ یان نەزانێ بەهاوکارو دەستبارگری دوژمنو ناحەزانی ماڵی خوا حیساب دەکرێو هەڵسوکەوتو ڕەفتارە کرچو کاڵەکانی دەچنە هەگبەو گیرفانی ناحەزانی ئیسلامەوە، وە لەڕاستیدا زۆریش نیزیکە گەلێك لەو جۆرە کەسانە هەر (دەست)ی دوژمنانیش بنو خزێنرابنە ڕیزی مسوڵمانانەوە بۆ هەرانانەوەو ئاژاوە دروست کردنو ناشیرین کردنی مزگەوتو ئەهلی مزگەوتو بەهانە دانە دەست دوژمنو ناحەزانیشەوە!!

## خاڵی چوارەم: ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت و نەمیەت و گرنگی پێدانی لەنێوان ساختەیی و حەقیقەت دا

مسوڵمانە بەرێزو خۆشەویستەکان!

خوای کاربەجێ لەسوورەتی (التوبة)دا لەئایەتی ژمارە (١٧)و(١٨)دا بۆمان روون دەکاتەوە داخوا کێ شایستەی ئەوەیەماڵەکانی خوا ئاوەدان بکاتەوەو کێش بەساختەچی و درۆزن دادەنرێ لەکاتێك دا لافی ئاوەدان کردنەوەی ماڵەکانی خوا لێبدات، فەرموویەتی: ﴿ماكان للمشركين أن يعمروا مساجد الله شاهدين على أنفسهم بالكفر أولئك حبطت أعمالهم وفي النار هم خالدون﴾ (التوبة: ١٧)

واتە: هاوبەش بۆخوا دانەرەکان شایستەی ئەوەنین کەمزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە، لەحاڵێك دا کەشایەدی لەخۆیان دەدەن کەکافرن، ئەوانە کردەوەکانیان هەڵدەوەشێنەوەو لەئاگری-دۆزەخ-یشدا هەمیشەیین. بەڵێ کەسانێك بەزمانی حاڵ شایەدی لەسەر کافربوونی خۆیان بدەن و هاوبەشی بۆخوا دابنێن لەپەرستن و بەندایەتی بۆکردنیدا چ وەك پێشکەش کردنی دروشمەکان (تقديم الشعائر)،وە چ وەك وەرگرتنی بەرنامەکان (اخذ الشرائع) چ لەنێو مزگەوت داو چ لەبازاڕو مەیدانی حوکم و سیاسەت دا، ئەوە ئەو جۆرە کەسانە لەحاڵێك دا کەدەستیان لەنێو گەورەترین گوناح دایە کەهاوبەشی بۆ خوا دانانە (الأشراك بالله) ئەهل و شایستەی ئەوە نین ماڵی خوایان پێ ئاوەدان بکرێتەوە، ئاخر چۆن ماڵی خوا بەدوژمنی خوا ئاوەدان دەکرێتەوە، یان چۆن کەسێك سەرزەوی خوا وێران بکات بەکوفرو شیرك ماڵی خوای پێ ئاوەدان دەبێتەوە، لەحاڵێك دا کەماڵەکانی خوا هەر بۆئەوە بنیات نراون کەپەیام و بانگەوازی خواپەرستی و خوا بەیەکگرتنیان تێدا ڕابگەیەنرێ و دژایەتی کوفرو شیرکیان تێدا بکرێ؟!!

بۆیە دەفەرموێ: ﴿أولئك حبطت أعمالهم وفي النارهم خالدون﴾ ئەوانەی کەئەهلی کوفرو شیرکن ئەگەر لەجیاتی مزگەوتێك پەنجاش دروست بکات، وەهەر شتێکی دیکە بکات ئەوە بەهۆی کوفرو شیرکەکەیەوە ڕەنج بەخەسارەو کردوو کۆش پووچ و بۆشە، ئەگەر ڕاست دەکات با لە پێشدا

خۆی ئاوەدان بکاتەوە ئەوجار ماڵ بۆ خوا دروست بکات، لەپێش خۆی بەندەی خوابێت پاشان ماڵ دروست بکات بۆ بەندایەتیکردن بۆ خوا!

ئەدی کێن ئەوانەی کە لە تەرازووی خوادا لەوە دەوەشێنەوە کەمزگەوتەکانی خوا بنیات بنێن و بەزیکرو طاعەتیش ئاوەدانیان بکەنەوە؟!

خوای زاناو پەنهان بین، دەفەرموێ: ﴿انما یعمر مساجد الله من آمن بالله والیوم الآخر وأقام الصلاة وآتی الزکاة ولم یخش الا الله فعسی اولئك أن یکونوا من المهتدین﴾ (التوبة: ١٨)، واتە بێگومان تەنیا کەسانێك مزگەوتەکانی خوایان پێ ئاوەدان دەکرێتەوە کەبڕوایان بەخواو ڕۆژی دوایی هەیەو نوێژ بەرپا دەکەن و زەکاتێ دەدەن و جگە لەخوا لەهیچ کەس و هیچ شتێك ناترسن ڕەنگە ئەوانە لەڕێرووني کراوان بن.

بەڵێ خوشك و برا مسوڵمانەکان! وەك شارەزایانی زمانی عارەبی دەڵێن، وشەی (انما) ئامرازی (حصر واثبات) ە، واتە ئەو ناوە یان ئەو کردارە کە دەچێتە سەری حوکم و وەسفەکەی تێدا کورت هەڵدێنێ و دەچەسپێنێ، بۆ وێنە: ئەگەر بتەوێ بڵێی:

((تەنیا ئەحمەد پزیشکێکی شارەزایە) دەڵێی: (انما الطبیب الحاذق احمد)، جا لێرەدا کە خوای پەروەردگار ویستوویەتی خەسڵەتی ئاوەدانکاری مزگەوتەکانی خۆی لە ڕووی مادی و مەعنەوییەوە تایبەت بکات بەو بڕوادارانەوە کە بە پێنج سیفەتی بنەڕەتی پێناسەی کردوون، ئامرازی ناوبراوی بەکارهێناوە، بۆ ئەوەی هیچ کەس گومان نەبات و دڵ لەدڵ نەدات کە غەیری ئەو جۆرە کەسانە کەسی دیکە شایستەیی ئەو کارە گرنگ و مەزنەی هەیە، ئینجا بێگومان ((بڕوا بەخواو بە ڕۆژی دوایی و نوێژ بەرپاکردن و زەکات دان و تەنها لە خواترسان)) یش پایەو بنەڕەتە سەرەکییەکانی مسوڵمانەتی پێك دێنن، چونکە بڕوا هێنان بەخوای پەروەردگارو بە ڕۆژی دوایی (الایمان بالله والیوم الآخر) دوو ئەسڵی هەرە مەزنی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامەتین کە بنچینەکانی دیکەش دەگرنە نێو خۆیان، وە نوێژو زەکاتیش (الصلاة والزکاة) _ کە مەگەر چۆن دەنا لە قورئانێ هەر پێکەوە باس دەکرێن _ دوو دروشمی هەرە مەزنی مسوڵمانانەتین، کەیەکەمیان (خواپەرستی)و دووەمیان (خەڵك دۆستی) یان تێدا دەدرەوشێتەوە، خواپەرستی و خەڵك

دۆستیش دوو شا باڵی سەرەکی دینداریو مسوڵمانەتین، وە جگە لە خوا لە هیچ نەترسانیش بەرهەمو زادەی ئەو ئیمانو ئیلتیزامەیە کە باس کران، وە کاتێکیش ئینسان بێجگە لە خوا لە هیچ کەسو شتێك ناترسێو لە هەموو خەمان دەڕەخسێ، کە بە ڕاستی بەندەی خوا بێو دەرو دەروونی بۆ خوا ساغو پاكو یەکلابووبێتەوەو خەوشی پێوە نەمابێ.

*کورتەی قسان:*

تەنیاو تەنیا بەندە ساغو ڕاستەکانی خوا کە بڕوادارەکانن شایستەییو تواناو مافی ئەوەیان هەیە کە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە چ لە رووی ماددیو رواڵەتییەوەو چ لە ڕووی نێوەڕۆكو مەعنەوییەوەو، غەیری ئەوان دەعوای خزمەتکردنو بە تەنگەوەبوونو مشوور لێخواردنیماڵەکانی خوا (جل جلاله) لە هیچ کەس ناسەلمێنرێو، حەتمەن هەرکەسێك بڕوادار نەبێو خاوەنی ئەو خەسڵەتانە نەبێ کەخوای زاناو شارەزا بەمەرجی گرتوون بۆ ئاوەدان کەرەوانی ماڵو مزگەوتەکانی خۆی، ئەوە هەرچەندە سامان خەرج بکات بۆ دروست کردنی ماڵەکانی خواو بە ڕواڵەت خەمیان لێبخواتو کۆڵیان پێوە هەڵبگرێو بگرە ئەگەر نوێژو طاعەتیشیان تێدا بکات ئەوە بێگومان جگە لە ڕەنج بەزایە چوونو ماندوو بوون هیچ ئەنجامێکی دیکەی نابێ، وەك خوای دادگەرو کاربەجێ ڕای گەیاندووە (أولئك حبطت أعمالهم)، ئەوە سەبارەت بە دواڕۆژو لای خوا، بە نسبەت دنیاشەوە بێگومان جگە لە خەڵکێکی سادەو سەرکێڵو ناحاڵی هیچ کەس هێندەی پووشکەیەك ئیعتیبار بۆئەو جۆرە کارو ڕەفتارە ڕواڵەتیو چەواشەکارییانە دانانێو پێیان هەڵناخەڵەتێ.

گەواتە: ئێستا بۆمان ڕوون بۆوە - لەبەر تیشکی فەرموودەی خوای پەروەردگاردا - کە ئاوەدان کردنەوەو خزمەت کردنی مزگەوتەکانی خوا بە حەقیقەتو ڕاستی چۆنەو بە کێ دەکرێ، وە بە درۆو ساختەو بۆ ڕووپامایيو چەواشەکاریش چۆنەو کێن ئەوانەی دروست کردنی ماڵەکانی خواو خزمەت کردنیانو بە ڕواڵەت بەرگری لێکردنو خۆ پێوە بەخەم کردنیان دەکەنە چاوپێچکی خەڵکی سادەو دەمامکی سەر ڕووی ساختەچییەتییان!!

## خاڵی پێنچەم:
## وێران کردن و تێکدانی مزگەوتەکان چی‌یەو چۆنە؟!

خوای پەروەردگار ئەو مەسەلەیەشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە چەند تاوانێکی زلە مزگەوتەکانی خوا یادی خوایان تێدا قەدەغە بکرێ‌و وێران بکرێن! دەفەرموێ: (ومن أظلم ممن منع مساجد الله أن يذكر فيها اسمه وسعى في خرابها اولئك ما كان لهم أن يدخلوها الا خائفين لهم في الدنيا خزي ولهم في الآخرة عذاب عظيم) البقرة - ١١٤ -

واتە: وە کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە مزگەوتەکانی خوا قەدەغە دەکات لەوە کەناوی خوایان تێدا باس بکرێ‌و هەوڵی وێران کردنیان دەدات!! ئەوانە بۆیان نیە بچنە ئەو مزگەوتانەوە مەگەر بە حاڵەتی ترس‌و بیمەوە، لە دنیادا زەبوونی بەشیانەو لەدوارۆژیش دا ئازارێکی مەزن.

*مسوڵمانینە سەرنج بدەن!* خوای دادگەرو تۆڵەستێن هیچ ستەم‌و تاوانێکی لەوە بە گەورەتر دانەناوە کە ماڵەکانی خوا لەبەندەکانی خوا قەدەغە بکرێت باسی ناوی خوایان - کە وەك پێشتر گوتمان هەر چالاکی‌و کردەوەیەك دەگرێتەوە کە لە مزگەوت بوەشێتەوەو ڕەزامەندی خوای تێدابێ - تێدا بکەن! وە خوای کاربەجێ (مەنع کردنی مزگەوتەکانی لە یادی خوا) ی بە هەوڵ دان‌و کۆشش کردن بۆ وێران کردنیان لە قەڵەم داوە!!

کەواتە: گەورەترین ستەم‌و خراپە لەلای خوا بریتیە لە قەدەغەکردنی مزگەوتەکان لە یادی خوا، وە ئەو ڕەفتارەش هەوڵ‌و تەقەللادانە بۆ وێران کردنی مزگەوتەکان! مادام وابێ بۆمان دەرکەوت کە کاول کردن‌و

تێکدانی ماڵەکانی خوا هەر ئەوەنیە کە بە پاچ و بێڵ هەڵی بوەشێنێ یان بە (T.N.T) بیتەقێنیەوە، بەڵکو وێران کردن و تێکدانی ماڵەکانی خوا بەوە دەبێ کە یادی خوایان تێدا مەنع بکرێ، ئایەتەکانی خوایان تێدا تەفسیر نەکرێن، فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوایان تێدا نەخرێنە ڕوو.

بەکورتی: خواپەرستی و بەندایەتی‌یان بۆ خوا تێدا نەکرێ بە هەموو جۆرو شێوەکانی خواپەرستی و بەندایەتی‌یەوە، ئەمەی گوترا دەقی فەرمایشتی خوای زاناو کاربەجێ‌یە نەك قسەی هەگبەو گیرفانی خۆمان بێت [4]، ئینجا ئایا ئەوانە کە ئەو تاوان و ستەمە زلە لە ماڵەکانی خواو لە بەندەکانی خوا دەکەن سزاو تۆڵەیان لەلای خواو خەڵکی خوا لەدنیاو دواڕۆژدا چی‌یەو سەرەنجامیان چۆنە؟!

(اولئك ماكان لهم أن يدخلوها الا خائفين) ئەوانە بۆیان نیەو نابێ ڕێیان بدرێ بچنە ئەو مزگەوتانەوە مەگەر بە ترس و لەرز، واتە دەبێ ئەهلی مزگەوت هەوڵ بدەن هێندە دەسەڵاتدارو باڵادەست بن کە ئەو جۆرە کەسانە دەرفەتی چوونە مزگەوتیشیان نەبێ مەگەر بە ترس و لەرزەوە چ جای بتوانێ ستەم و دەستدرێژی بکاتە سەر مزگەوت و ئەهلی مزگەوت!! توێژەرەوانی قورئان ئاوا ئەم ڕستە قورئانی‌یەیان تەفسیر کردووەو لێکداوەتەوە، [5] ئینجا ئایا سزاو تۆڵەی دنیایی بەدەستی

---

[4] دیارە لەم ئایەتەدا کە باسی وێران کردنی مزگەوتەکانی خواکراوە وشەی (خرابها) هەردوو جۆرە وێران کردنەکە دەگرێتەوە. هەم وێرانکردنی ماددی و ڕواڵەتی و هەم وێران کردنی مەعنەوییش، وە دیارە مەبەست لە وێرانکردنی مەعنەوی بریتیە لە چۆلکردنی مزگەوتەکان لە بەندەکانی خواو تێدا قەدەغەکرانی خواپەرستی و طاعەتیان. بڕوانە (اضواء البيان) للشنقيطي ج١ ص٤٢.

[5]، بڕوانە: (الجامع الأحكام القران) القرطبي ج٢ ص٩٧، هەروەها بڕوانە: (الاساس في التفسير) ج١ ص٢٢٢-٢٢٣، هەروەها (ابن كثير) کە دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێ: (هذا خبر معناه الطلب اي لاتمكنوا هؤلاء اذا قدرتم عليهم من دخولها الا تحت الهدنة والجزية) بڕوانە (الاساس في التفسير) ج١ ،ص٢٢٢، دیارە (نَسَفي) یش بەهەمان جۆر تەفسیری کردووە، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ج١ ص ٢٢٣.

مسوڵمانان بۆ ئەو ستەمکارانە هەرئەوەیەکە بە ترس و بیمەوە نەبێ ڕێی چوونە مزگەوتیان نەبێ؟! نەخێر بەڵکو (لهم في الدنيا خزي) لە دنیادا بەشیان سەرشۆڕی و زەبوونی‌یە، بەڵێ پێویستە مسوڵمانانو ئەهلی مزگەوت هێندە بە زەبرو جەربەزە بن کە هەرکەسێك دەستدرێژی بکاتە سەرماڵەکانی خواو حورمەتیان بشکێنێ تۆڵەی لێ بستێنن و ڕیسواو شەرمەزارو زەبوونی بکەن! ئەمە سزاو تۆڵەی دنیا، لەدواڕۆژیش دا سزاو ئازاری مەزن و بێزەزا (وَلهم في الآخرة عَذاب عَظيم)، بێگومان هەر ئەوەش سزاو تۆڵەی شایستەو پڕ بە پێستە بۆ هەرکەسێك کە ئاوا دژایەتی خواو بەندەکانی دەکات و هەوڵی وێران کردنی مزگەوتەکانی خوا دەدات و حەز بە بیستنی ناوی خواو ئایەتەکانی ناکات!

لەم ئایەتە بە پێزەشەوە دەردەکەوێ کە دروست نیە مسوڵمانان بەبێ دەستەڵاتی و داماوی ڕازی بن و لە حاڵەتێك دا بمێننەوە کە توانای بڕستی لەسەرکردنەوەو بەرگری لێکردنی مزگەوتەکانیان نەبێ! بەڵکو لەسەریان پێویستە کە گورج و گۆڵانە دەست بەکاربن بۆ خۆ ئامادەکردن و پێکەوەنانی هێزو دەستەڵات تاکو بتوانن بەو شێوە کە لەم ئایەتەدا هاتووە لەگەڵ دوژمن و ناحەزانی ماڵی خوادا هەڵس وکەوت بکەن، نەك بەبێ دەستەڵاتی دەست لە ئەژنۆیان وەربهێنن و لە بەرانبەر ستەم و دەستدرێژی دوژمنانی خواو خۆیاندا هەر بەوردنە وازبێنن کە ویردی (لاحول ولا قوة الا بالله) بخوێنن!! خوا پشتیوان بێ لە خاڵی شەشەمیش دا زیاترو چاکتر ئەم مەسەلەیە دەتوێژینەوە.

## خاڵی شەشەم:

## مزگەوتەکان، ماڵەکانی خوا چۆن چۆنی بەرگری‌یان لیٚ دەکریٚو لە ویٚران کران دەپاریٚزریٚن؟!

ئایا بە چ شیٚوەیەك دەتوانین بەرگری لە ماڵەکانی خوا بکەین‌و نەهیٚڵین کاول‌و ویٚران بکریٚن، چ ویٚران کردنی مەعنەوی چ ماددی‌و رواڵەتی؟! وەك پیٚشتریش ڕوونمان کردەوە ویٚران کردنی مەعنەوی ئەوەیە کە نەهیٚڵریٚ خوایان تیٚدا بپەرستریٚو دروشمەکانی ئایینی خوایان تیٚدا بەرپابکریٚن‌و ڕاستی‌یەکانی قورئان‌و سووننەتیان تیٚدا بەیان بکریٚن، ویٚران کردنی ماددیش ئەوە بوو کە ڕژیٚمی بەعس لەگەڵ مزگەوتەکانی کوردستان کردی کە هەموویانی بەسەریەکدا ڕووخاند، خوای کاربەجیٚو باڵادەست‌و زاڵ وەڵامی ئەو پرسیارەشمان دەداتەوەو ئەو حەقیقەتە مەزنەش لە ئایەتی ژمارە (٤٠) ی سوورەتی (الحج) دا ڕوون دەکاتەوەو دەفەرمویٚ:

﴿... ولو لا دفع الله الناس بعضهم ببعض لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ ومساجدُ يذكر فيها اسم الله كثيراً ولَيَنصرنَّ اللهُ مَنْ ينصره ان الله لَقَوِيٌّ عزيزٌ﴾.

واتە: وە ئەگەر هاتباو خوا هەندیٚك لە خەڵکی بە هەندیٚکیان بەرپەرچ نەدابایەوەو پاڵی پیٚوە نەنابان ئەوە هەموو دیٚرو[6] کڵیٚساو[7] کە نیشتەو[8] مزگەوتەکان کە زۆر ناوی خوایان تیٚدا باس دەکریٚ دەڕووخیٚنران، وە بیٚگومان هەرکەسیٚك پشتگیری – ئاینی – خوا بکات خوا سەری دەخات چونکە بەڕاستی خوا بەهیٚزو زاڵە.

---

[6] صومعە (دیٚر) کە کۆیەکەی (صوامع) ە ئەو شویٚنەیە کە نەصرانیە ڕەبەنەکان بە تەنها خواپەرستی‌یان تیٚدا دەکرد.

[7] بیعة (کڵیٚسا) کۆیەکەی (بیع) ە پەرستگای‌بەکۆمەڵی نەصرانی‌یەکانە.

[8] صلوات (کەنیشتە) پەرستگای بەکۆمەڵی جولەکەکانە.

*مسوڵمانە بەڕێزو خۆشەویستەکان!* وەك دەبینن خوای پەنهان بین و کاربەجێ زۆر بە ڕاشکاوی ئاگادارمان دەکاتەوەو تێمان دەگەیەنێ کە سەرجەم پەرستگاکانی نەصرانی و جوولەکەو مسوڵمانەکان تەنیاو تەنیا لە سایەی جەنگ و جیهادو بەرەنگاری و بەرپەرچ دانەوەی طاغوتە ملهوڕەکان دا دەمێننەوەو هەرکاتێك پەرستگاکان (المعابد) هێزو چەك نەبێتە پەرژین و قەڵغان و سوپەریان ئەوا طاغوتە زۆردارو بێ ویژدانەکان بۆئەوەی ڕێگا بۆ پەرسترانی خۆیان تەخت بکەن! ماڵەکانی خوا وێران دەکەن چ بەشێوەی ماددی و ڕواڵەتی و چ بەشێوەی مەعنەوی کە خواپەرستی و دینداری‌یان تێدا مەنع و قاچاغ بکەن، چونکە بێگومان هەر گەل و کۆمەڵێك خوا بناسێ و خواپەرستێ بەخۆی ڕەوا نابینێ غەیری خوا بپەرستێ، بۆیە طاغوت و نەمردوودو فیرعەونەکان بۆئەوەی ڕێ بۆ پەرسترانی خۆیان خۆش بکەن ماڵەکانی خوا وێران دەکەن و بەندایەتی کردن بۆخوا قەدەغە دەکەن!

ئینجا شتێکی ئاشکرایە کە ئەم مزگەوتی (جیهاد) ەو هەر مزگەوتێکی دیکەی کە لەم شاری سلێمانی‌یەدا هەیەو، هەر مزگەوتێکی دی کە لە کوردستان و لە هەموو جیهانی ئیسلامی‌دا هەیە، ڕێزو حورمەتەکەیان لەوەدایە کە خوایان تێدا دەپەرسترێ و بەندایەتی‌یان بۆ خوای پاك و تاك تێدا دەکرێ، ئەگەرنا چوار دیوارێك و مینبەرو میحرابێك ڕێزو حورمەتەکەیان شتێکی زاتی‌ی نی‌یە، چونکە شوێنی‌تر هەیە لێرە خۆشترو بەرزترو مەحکەم ترو چاکتریش دروست کراوە، ئەی بۆچی ئێرە بەڕێزو حورمەت و شکۆدارەو ئەو شوێنەی تر وا نیە! دیارە هۆیەکەی هەر ئەوەیە کە ئێرە ماڵی خوایەو خوای تێدا دەپەرسترێ و دینداری تێدا دەکرێ، کەواتە هەرکاتێك ئەم ماڵی خوایەو هەرماڵێکی تری خوا دینداری و خواپەرستی تێدا قەدەغەکراو ڕێی لێگیرا، مانای وایە سووکایەتی پێکراوەو ڕێزو حورمەتەکەی لێ زەوت کراوەو وێران کراوە!

ئینجا ئەو سووکایەتی پێکران و حورمەت و ڕێز شکێنرانەی ماڵەکانی خوا لە کوێش دا دەکرێ! لە کوردستانێکی وێران و بێ ناونیشان داو لەنێو میللەتێکی ستەمدیدەو کەساس دا کە دوێنێ نیری طاغوتێکی لەسەرشان لاچووە! بەڕاستی ئەوە ستەمو تاوانێکی گەورەیە نەك هەر لە ڕوانگەی ئیسلام و بەپێودانگی دینداری بەڵکو لە ڕووی نەتەوایەتیشەوە چونکە میللەتێك عەقیدەی نەبێت ئەخلاقیشی نابێت، گەلێك دیندار نەبێ چاکەکارو وەفاداریش نابێ، کەواتە بەڕاستی هەرکەسێك و هەر لایەنێك دژایەتی ماڵەکانی خوا بکات و مسوڵمانان مەنع بکات لەوە کە ئەرکی عەبدایەتی خۆیان لە مزگەوتەکانی خوادا ئەنجام بدەن ئەوە بزانێ یان نەزانێ خائین و موخەننەتە بەرانبەر بەم میللەتە، ئاخر ئەم میللەتە ئەوەندەی کە ماویشە بە ئیسلامەوە ماوەتەوە، بەو عەقیدەو ئیمان و عیبادەت و ڕەوشتەوە ماوە کە لە ئیسلامی وەرگرتووە، ئەگەرنا لە سۆنگەی شوێن کەوتنی بیردۆزەو ڕێچکەوپێچکە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکانەوە دەبووینە کەوی برابراو وەك تۆوی پەڵپینە (پڕپڕە) دەپرژاین و بە هیچ کەس کۆنەدەکراینەوەو نەدەدۆزراینەوە!

ئێمە بەهۆی ئیمان و ئیسلامەوە کۆین و ئەو ڕەسەنایەتی و نەجابەت و ڕەوشتە بەرزو جوانانەی کە لەنێو گەلی کورددا هەن لە ئیسلامەوە بۆی ماونەوەو لە قورئان و سوونەنەت و شەرعەوە وەری گرتوون، لە پێشینەی چاکمان کە وەچە بەوەچە ڕۆڵەکانیان لەسەر بارهێناوەو پەروەردە کردوە، ئیسلامە کەوای کردوە گەنج و لاو ڕێز لەپیرو تەمەندارەکان بگرن و ئەوانیش بە لوتف و بەزەییەوە لەگەڵ گەنج و لاوەکان دا ڕەفتار بکەن، دینداریە کە ژن و مێرد وا لێدەکات پێکەوە وەفاداربن و، دەرودراوسێ و خزم و دۆست پێکەوە چاکەکاربن و، کۆمەڵگا لەگەڵ هەتیوو نەدارو پەککەوتەو ڕێبواردا بەبەزەیی بێت، کەواتە هەرکەسێك دژایەتی ئەهلی ئیمان و ئیسلام بکات بەهۆی ئیهانەکردن بە ماڵەکانی خواو وێران کردنیان، ئەوە کارێك دەکات وەك مەلای مەزبوورە!

جارێك مەلای مەزبووره دەچێتە سەر درەختێك بۆ بڕینەوەی هەر ئەو لقە درەختەی دەبڕیەوە کە بۆ خۆی لەسەری ڕاوەستابوو! بۆیە پێش لقە درەختەکە خۆی کەوتە خوارو پێش هەموو شوێنێکی تەپڵی سەری وەزەوی کەوت!!

بەڵێ خوشك و برایانی مسوڵمان! ئەگەر بمانەوێ ماڵەکانی خوا ڕێزو حورمەتیان نەشکێ و کەرامەتیان پارێزراو بێ و، ئەو ئەرکەی کە خوا لەسەر مسوڵمانانی فەرزکردوه تێیان دا ئەنجام بدرێ، دەبێ خەمی هێزو دەستەڵات بخۆین، دەبێ کارێك بکەین کە وەك نێچیرێکی تووك نەرم و پارووێەکی چەور سەهل نەکەوینە بەرچاوی ئەو دوژمنو ناحەزانەی خواو خۆمان کە تۆسقاڵێك ڕوحم و وێژدانیان نیە!

بەڕاستی زۆر عەجایبە! لەسەرتاسەری دنیادا ئەوەی کە زوڵمی لێدەکرێ و بێبەزەییانە دادەپڵۆسرێ مافەکانی پێشێل دەکرێن و بگرە هەر مافی ژیانی پێ ڕەوا نابینرێ بەس مسوڵمانانن، هەرزانترین خوێن خوێنی مسوڵمانە! کەچی بەناهەق مسوڵمانان دەخرێنە قەفەزی ئیتیهامەوە، لەم ڕۆژانەدا بینیمان چۆن مسوڵمانانی (کۆسۆڤۆ) چل پەنجایەکیان وەك قەسابخانە لێ کەللەپاچە دەکرێن و دەکەونە گۆڕێ و وەك هەواڵێکی زۆر سادەو ئاسایی لە دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی زلهێزە کافرەکان باس دەکرێ، بەڵام ئەگەر بابایەکی ئەمریکی یان ئەورووپی لە یەمەن یان لە شوێنێکی تر لووتی بەخوێن دابێ ئەوە قیامەت بەرپا دەکەن! ئەوە چی دەگەیەنێ! ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوانە بەس خۆیان پێ مرۆڤەو مسوڵمانان بە ئینسان نازانن، وەك شاعیرێك گوتوویەتی:

قتل شخص فی غابة جریمة لا تغتفر

ابادة شعب أعزل قضیة فیها نظر

واتە: نەفەرێك لە جەنگەڵێك دا دەکوژرێ تاوانێکە هەر نابڕێتەوە دەبێتە خوێنی سیاوەحش بەڵام میللەتێکی بێدەستەڵات قەڵاچۆو بن بڕ دەکرێ ئەوە کێشەیەکی جێگای مشتومڕە کە ئایا لێی بپێچرێتەوە یان نا؟.

بەڵێ دنیاو ڕۆژگاری ئەمڕۆ لە سایەی شوومی کوێخایەتی و حوکمڕانی ئەمریکاو ڕۆژئاواداو بەهۆی حوکمی ڕێچکەو پێچکەو بیردۆزە

مرۆڤکردەکانەوە ئاوایە، کەواتە بێگومان زۆر سادەو فەقیرحاڵین ئەگەر پێمان وابێ تەنها بە دووعاو نزا مزگەوتەکانمانو بەهاکان (قیم) ی ئاینەکەمانمان بۆ سەلامەتو پارێزراو دەبن، ئەمە خەیاڵێکی خاوو فیکرێکی بڵاوو بۆچوونێکی ناتەواوە! چونکە ئەم ئاینە هەمووی بەیەکەوە کار دەکات هەروەك چۆن سەیارەیەك یان ئامێر (آلة) ێك هەموو دەزگاو بەشەکانی پێکەوە کار دەکەن، ئەم ئیسلامەش هەموولایەنەکانی بەیەکەوە دەتوانن کاربکەن، مزگەوتەکەی پێوستە چەكو هێزی لە پشتەوە بێو هێزو دەستەڵاتەکەش دەبێ حیکمەتی لەگەڵ دابێ، عیلمەکەی دەبێ لەگەڵ تەقوادا جووت بێتو، سیاسەتەکەی پێویستە جیهادی لەگەڵ بێو، جەنگو بەرەنگاری‌یەکەی پێویستە بانگەوازو پەروەردەی لە پێشەوەو لەگەڵ داو لە پشتەوە بێت! پیرەکان دەبێ گەنجو لاوی دڵگەرمو بە حەماسەتیان لە خزمەت دا بێو، گەنجەکانیش دەبێ پیرە خاوەن تەگبیرو ژیرەکان چاوساغو مشوورخۆریان بن، پیاوان دەبێ ئافرەتان شانبەشانیان بن، مامۆستا دەبێ خەڵکی لەگەڵ بێتو خەڵکیش پێویستە مامۆستایان پێشیان بکەون، مزگەوت نابێ لە بازاڕ دابڕێو سیاسەتو کەسابەت ناکرێ لە عیبادەت و طاعەت یاخی بنو لێك بپچڕێنو لێك وەدوور بخرێن!

ئینجا لە ڕاستی‌دا ئەوە بەس مزگەوتەکان نین کەتەنها لە سایەی هێزو دەستەڵاتو جەنگو جیهاددا سەربەرزو سەلامەتو ئاوەدانو پارێزراو دەبن بەڵکو تێکڕای ئایین بە گشتی تەنیا لە سایەی هێزو دەستەڵاتی جەنگاوەرانی ئیسلامو مسوڵمانانی موجاهیددا دەمێننەوەو دەپارێزرێو بە پێچەوانەوە ئیسلام دووچاری پووکانەوەو لەنێوچوونو مسوڵمانانیش گیرۆدەی ژێردەستەیی‌و زەبوونی دەبن، هەربۆیەش خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة ويكون الدين كلة لله ..﴾ (الانفال: ) واتە: وە لەگەڵیان بجەنگن هەتا ئازارو ئەشکەنجە - لەسەر مسوڵمانان - نامێنێو ملکەچی هەمووی تەنیا بۆخوا دەبێ..

پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموویەتی: (لَنْ يَبْرَحَ هذا الدِّينُ قائِماً حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ يُقاتِلُ عَليه عِصابَةٌ مِنَ المسلمين) رواه مسلم.

واتە: بەردەوام ئەم ئایینە بە ڕاوەستاوی دەمێنێ هەتا ڕۆژی دوایی دێ، کۆمەڵێکی تۆکمە لە مسوڵمانان جەنگی لەسەر دەکەن.

دیسان نەك تەنها مزگەوتەکانی ئیسلام و بەها بەرزەکانی ئیسلام لە سایەی جیهادو هێزو دەستەڵاتی ئەهلی ئیمان دا دەمێنێتەوەو دەپارێزرێن، بەڵکو سەرجەم پەرستگاکانی خاوەن ئایینەکانی دیکەش لەژێر سێبەری جەنگ و جیهادی ئەهلی ئیسلام دا دەپارێزرێن لە ڕوخێنرانی ماددی و وێران کردنی مەعنەوی! وەك لەو ئایەتەدا دەبینرێ کە لەسەرەتای ئەم خاڵەوە هێنامانەوە، هەروەها واقیعی مێژوویش هەر ئەوەی تێدا بەرچاو دەکەوێ، ئەوەتا لە درێژەی حوکمی هەشت سەدەیی ئیسلامی لە ئەندەلووسی جاران و ئیسپانیای ئێستادا کڵێسایەك نەڕووخێنراوەو نەصرانی یەك بەزۆر مسوڵمان نەکراوە، وە لە ماوەی سێزدە (١٣) سەدەی حوکمی ئیسلامی دا پەرستاگاکانی جوولەکەو نەصرانی یەکان و کەمایەتی یە ئایینی یەکانی دیکە هەر بە پێوەو ئاوەدان ماونەوەو هیچ کەس نەیتوانیوە هیچ جۆرە دەستدرێژی یەکیان بکاتە سەر، بەڵام ئاشکراشە کە چ نەصرانی و خاچ پەرستەکانی دوێنێ چی یان بە مسوڵمانان و مزگەوتەکانیان کرد لە ئەندەلووس و فەلەستین دوای ئەوەی ئەو ناوچانەیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، هەروەها لە درێژەی ئەم سەدەی بیستەش دا ((گا)) پەرستەکانی هیندستان و بت پەرستەکانی چین و ماددە پەرست و شیوعی یەکانی یەکیەتی سۆڤێتی پێشوو، چی یان بە مسوڵمانان و مزگەوتەکانیان و بەها بەرزەکانی ئایینەکەیان کرد لە هیندستان و کشمیر، لە چین و لە ویلایەتە زەوت کراوو بە زۆر لکێنراوەکانی ژێر دەستەڵاتی ڕووسیای شیوعی [٩] !!

---

[٩] تەنیا لە شاری (سەمەرقەند) شیوعی یەکانی ڕووسیا چواردە هەزار (١٤،٠٠٠) مزگەوتیان ڕووخاند، یان گۆڕیانن بە شوێنی تر نەیانهێشت یادی خوایان تێدا بکرێ، بڕوانە: (الاساس في التفسير) ج١، ص٢٢٢.

## خاڵی حەوتەم: مزگەوت لە سوننەت و سیرەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چی بووەو چۆن بووەو چ ڕۆڵێکی گێڕاوە؟!

مسوڵمانینە با لە کۆتاییدا لەبەر ڕۆشنایی سوننەت و سیرەی کردەیی پێغەمبەر(ﷺ)و جێنشینە سەر ڕاستەکانیدا خوا لێیان ڕازی بێ سەرنج بدەین! ئایا ئێمەی ئیسلامی بوختان بە مزگەوتەکانەوە دەکەین کە دەڵێین دەبێ جێگای عیبادەت و طاعەت و زیکرو فیکرو زانست و پەروەردەو حوکم و سیاسەت و بانگەوازو جیهاد بن و دەبێ جێگای هەموو جۆرو شێوەکانی خواپەرستی بن؟!

تەماشا بکەن چۆن پێغەمبەر (ﷺ) پاش نیشتەجێبوونی لە شاری مەدینەدا یەکەمین کارێك کە کردی ئەوەبوو مزگەوتی دروست کرد، ئەوە شتێکی ئاشکرایە لە سیرەو ژیانی پێغەمبەردا( ﷺ) کە یەکەمین کاری بریتی بوو لە بنیاتنانی مزگەوت، چونکە کتێب و سەرچاوەکانی سیرە دەڵێن پێغەمبەری خوا( ﷺ) پاش کۆچ کردنی لە مەککەوە بۆ مەدینە لەسەر سێ بنەمای گرنگ کۆمەڵگای نوێی ئیسلامی لە مەدینەدا دامەزراند:

أ) دروست کردنی مزگەوت.

ب) برایەتی لەنێو مسوڵمانان دا بە گشتی و لەنێوان کۆچکەران و پشتیوانان دا (المهاجرين والانصار) دا بە تایبەتی.

ج) نووسینی دەستوورو پەیماننامە (الوثيقة) بۆ چۆنیەتی ڕەفتارو هەڵس وکەوتی کۆمەڵگای مەدینە لەنێو خۆی و لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا.

دیارە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك عادەتی خۆی خۆیشی بەدەستی خۆی لەگەڵ هاوەڵانیدا بەشداری دروست کردنی مزگەوتەکەی دەکرد.[10]

---

[10] لە کتێبی (الصحيح البخاري) دا هاتوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو زەوییەی کەمزگەوتەکەی لەسەر دروستکرد لە دوو منداڵی هەتیوی کڕی کە لە کەفالەتی (اسعد بن زرارة) دا بوون، هەروەها دەڵێ لەکاتی بەردکێشان و گواستنەوەدا پێغەمبەر (ﷺ) خۆشی لەگەڵیان دا بوو سروودیان دەگوت و پێغەمبەریش دەیفەرموو (اللهم لا خير الا خَيْرُ الآخرة فانصر الأنصار والمهاجرة).

کەواتە: مزگەوت بەردی بناغەی ئەو کۆمەڵگاو قەوارە ئیسلامی‌یە بووە کە پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) لە شاری مەدینەو شارو شوێنەکانی تردا وێڕای ئەوەی کە بە جێگای دروشمەکانی پەرستن (شعائر التعبد) وەك پێنج نوێژە فەرزەکان کە بە کۆمەڵ دەکرێن و نوێژی جومعەو نوێژی هەردووك جەژنی ڕەمەزان و قوربان و قورئان خوێندن و زیکرو ئیعتیکاف و.... هتد بوون و لەگەڵ ئەوەش دا مزگەوتەکان کانگاو سەرچاوەی فێرکردن و پەروەردەکردن (التعليم والتزكية) و تێگەیاندن و پێگەیاندنی ئەندامانی کۆمەڵگاش بوون بە نێرو مێ و وردودرشتەوە لە هەموو بوارەکانی فێربوون و پەروەردە بوون و تێگەیشتن و پێگەیشتنەوە، چ ڕووحی چ ڕۆشنبیری چ کۆمەڵایەتی چ خێزانی چ سیاسی چ جیهادی، دیارە پەروەردە بوون و پێگەیشتنیش لە ئیسلام دا کاتێك بە پەروەردەی ڕاستەقینەو پێگەیشتنی تێرو تەواو دادەنرێ کە ئاوا هەموو لایەنەکانی ڕووح و عەقڵ و دەروون و جەستە وکەسایەتی ئینسان تێکڕای بوارەکانی ژیان و گوزەران دابگرێ و هیچ شتێك لە دین و ژین نەبوێرێ و هیچ لایەنێك لە تاك و کۆمەڵ فەرامۆش نەکات و پشت گوێ نەخات.

ئێستاش با چەند نموونەیەك لە چالاکی‌یەکانی نێو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بێنینەوە:

١. {عن ابي بكرة رضي الله عنه قال: كُنَّا عند رسول الله (ﷺ) فانكسفت الشمس فقام النبي (ﷺ) يجر رِداءهُ حتى دخل المسجد، فدخلنا فصلى بنا ركعتين حتى انجلت الشمس فقال (ﷺ) ((ان الشمس والقمر لا ينكسفان لموت احد فأذا رايتموهما فصلوا وادعوا حتى يكشف مابكم))} رواه البخاري

وفي رواية أخرى للبخاري: {كسفت الشمس على عهد رسول الله (ﷺ) يوم مات ابراهيم، فقال الناس كسفت الشمس لموت ابراهيم}.

وەك دەبینن لەکاتێك لەسەردەمی پێغەمبەردا (ص) ڕۆژ گیراوەو خەڵك وایان زانیوەکە لەبەر مردنی (ابراهيم) ی کوڕی پێغەمبەر (ﷺ)

---

بروانە (صحيح البخاري) ج١،ص١١، وە ج٤ ص ٢٥٨، وە بروانە (فقه السيرة) للبوطي ص ١٩٤،١٩٣.

گیراوه، کەوا دیارە ئەویش لە هەمان ڕۆژدا وەفاتی کردووه، یەکسەر پێغەمبەری خوا( ﷺ) خەڵکەکەی لە مزگەوت کۆکردۆتەوه ئەو هەڵە فیکرییەی بۆ خەڵکەکە ڕاست کردۆتەوەو هەڵوێستی شەرعی ڕاستو دروستیشی فێرکردوون کە لە بەرانبەر ئەوجۆرە دیاردانەدا چی بکەنو چۆن بکەن.

کەواتە: مزگەوت لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ( ﷺ) جێگای بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری ڕەسەنو ڕاست کردنەوەی هەڵەو بۆچوونە فیکرییەکانو ڕەواندنەوەی تەمومژی گومانو بیرە ئەفسانەییەکان بووه!

٢) لە (صحیح البخاري) دا هاتوه، لە (عائشة) وە خوا لێی ڕازی بێ کە بەسەرهاتی بوختان پێکرانەکەی خۆی دەگێڕێتەوه، هەتا دەگاتە ئەو شوێنەی کە دەڵێ: {فقام علیه الصلاة والسلام علی المنبر فقال: یا معشر المسلمین من یعذرني من رجل قد بلغ اذاه في أهل بیتي؟ فوالله ماعلمت علی أهل بیتي الا خیراً، ولقد ذکروا رجلاً ماعلمت علیه الا خیراً، فقام سعد بن معاذ، فقال: انا أعذرك منه یا رسول الله، ان کان من الاوس ضربنا عنقه وان کان من اخواننا الخزرج أمرتنا ففعلتنا أمرك، فتلاغط الناس في المسجد حتی أسکتهم رسول الله ( ﷺ)}[11]

لێرەش دا دەبینین کە لە کاتێك کۆمەڵگای ئیسلامی بە پیلانو فێڵی دەغەڵو دوو ڕووەکان ڕووبەڕووی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر گەورە دەبێتەوه کە بریتییە لە بوختان کردن بۆ هاوسەری پاكو بەڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ کە (صدیقة) ی کچی (صدیق) ە!! پێغەمبەری خوا ( ﷺ) بۆ چارەسەری ئەو کێشە دیسان مسوڵمانان لە مزگەوت کۆدەکاتەوەو بە ڕاشکاویو بێپێچو پەنا مەسەلەکەیان لەگەڵ باس دەکاتو هەڵوێستو بیروڕای خۆیشی دەخاتە ڕوو و وە داوای بیروڕاو هەڵوێستی مسوڵمانانیش دەکات، کەواتە مزگەوت جێگای خستنەڕوو و چارەسەری کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتیو خێزانییەکانی کۆمەڵگای مسوڵمانیشه.

---

[11] هەروەها بڕوانە: (فقه السیرة) محمد سعید رمضان البوطي ص (٢٨٠،٢٧٩).

٣) (بخاري و مسلم) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ هەردووکیان ئەم فەرمودەیە لە (ابو هريرة) ەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە:

{بينا الحبشة يلعبون عند رسول الله (ﷺ) بحرابهم اذ دخل عمر بن الخطاب رضي الله عنه فأهوى الى الحصباء يحصبهم، فقال رسول الله (ﷺ) دعهم يا عمر}.

واتە: لەکاتێك دا حەبەشەییەکان لەلای پێغەمبەر (ﷺ) — لە مزگەوت — یاریان بە نێزەکانیان دەکرد، عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ هاتە ژوور دەستی برد بۆ بەردی ورد (چەو) کە پێیان دا بدات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی عومەر لێیان گەڕێ!.

هەروەها گێڕاویانەتەوە کە جارێك حەبەشەییەکان لە مزگەوتێ بە نێزەکانیان یاری‌یان دەکرد و مەشقیان دەکرد (عائشة) ی هاوسەری پێغەمبەریش خوا لێی ڕازی بێ لە پشت پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەستابوو تەماشای دەکردن‌و پێغەمبەریش (ﷺ) هانی حەبەشەییەکانی دەدا لەسەر مەشق‌و یاری‌یەکەیان‌و دەیفەرموو: (دونكم يا بني أرفدة).

(نووی) ڕەحمەتی خوای لێ‌بێ‌لە شەرحی ئەو فەرموودەیەدا گوتوویەتی: (فيه جواز اللعب بالسلاح ونحوه من آلات الحرب في المسجد، ويُلْحَقُ به ما في معناه من الأسباب المُعِيْنَةِ على الجهاد...) [١٢].

واتە: لەم فەرموودەیە وەردەگیرێ کە دروستە لە مزگەوت دا یاری‌و مەشق بە چەك‌و ئامێرەکانی جەنگ بکرێ، هەروەها هەر هۆیەکی دیکەی یاریدەدەر لەسەر جیهاد هەمان حوکمی هەیە.

کەواتە: لەسەردەم‌و ڕۆژگاری پێغەمبەردا (ﷺ) مزگەوت جێگای مەشق‌و ڕاهێنانی موجاهیدان‌و جەنگاوەرانی ئیسلامیش بووەو پێغەمبەر (ﷺ) هانیشی داون لەسەر ئەو مەشق کردن‌و ڕاهێنانە.

هەروەها هەر بەوبۆنەیەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ڕوونکردنەوەی حیکمەتی ئەو ڕێگا پێ‌دانەی فەرموویەتی:

---

[١٢] بڕوانە (الآداب الشرعية) ج٤ ص ٣٤ ـ ٣٥

(لتعلم يهود أن في ديننا فسحة، أرسلت بحنيفية سمحة) رواه احمد بسند حسن. واتـه: بۆئـەوەی جوولەکـەکان بزانـن کـە بەرنامەکـەمان فراوانـی و سانایی تێدایە، چونکە من ئاینێکی ڕاست و ئاسانم پێدا ڕەوانەکراوە.

٤) ئینجا شتێکی ئاشکرایە کە هەرچوار جێنشینە سەرڕاستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) (ابوبکر، عمر،عثمان، علي) خوا لێیان ڕازی بێ لە مزگەوتی پێغەمبەردا مسوڵمانان بەیعەتیان پێکردوون بە خەلیفە هەڵیان بژاردوون، کە بێگومان هەڵبژاردن و بەیعەت پێکرانی هەرکامێکیان بەڕووداوە سیاسییە هەرە گەورەو گرنگەکانی مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان لە قەڵەم دەدرێن!

جا خوشك و برا مسوڵمانە بەڕێزەکان، ئێستا کە وەك لوێچێك لە تەغارێك ئەو چوار نموونەیەمان هێنانەوە بۆ ئەو ئەرك و چالاکی یانەی کە لە مزگەوت دا ئەنجام دراون لە ڕۆژگاری موبارەکی پێغەمبەر (ﷺ) و جێنشینە سەر ڕاستە کان (الخلفاء الراشدون) دا، کە نموونەی یەکەمیان بۆ لایەنی عیلمی و فیکری و هی دووەمیان بۆ لایەنی خێزانی و کۆمەڵایەتی و هی سێیەمیان بۆ لایەنی جەنگ و جیهادو هی چوارەمیشیان بۆلایەنی حوکم و سیاسەتە!! زۆر باش دڵنیا و بەرچاو ڕوونین کە مزگەوتەکان، ماڵەکانی خوا چین و دەبێ چۆن ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێ و چ ئەرك و کارێکیان تێدا ئەنجام بدرێ، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە پووچەڵی و ناماقووڵی ئەو قسەو قاڵانەشمان زۆر چاك بۆ ئاشکرابوو کە دەڵێ:

(با قوودسیەتی مزگەوت پێشێل نەکرێ و نەکرێتە جێگای ململانێی سیاسی!!).

بەڵێ قسەی گۆرینی کتو مت وەك ئەو قسانەی ترە کە دەیانگوت و ئێستاش دەیلێن:

(دین و دەوڵەت لەیەك جیان) یان (ئیسلاممان قبووڵە بەڵام ئیسلامی سیاسی نا) یان (لاسیاسة في الدين ولا دين في السياسة) !!

بەڵێ ئەوجۆرە قسانە سەرجەم هەڵقوڵاوی یەك سەرچاوەو ڕەشاوی یەك هەناون، ئەویش بابایەکە یان سادەو سەرکێڵ و بێئاگایەو بە فیکری

ڕۆژئاوا گۆش کراوەو بە شیری گوانی بیردۆزێك فرچك دراوە، یاخود داخ و قین لە دڵەو بوغزو غەرەزی لە بەرنامەی خواو بەندەکانی خوا هەیەو دەیەوێ بەو جۆرە قسە بێ سەرو پێیانە خەڵکی بەسەهوو ببات و چەواشەیان بکات، ئەگەر نا وەك ڕوونمان کردەوە ئیسلام بەو ماڵماڵۆکێنەو گوریس پچڕکێنەیە ڕازی نیەو، لە ئیسلام دا دین و دەوڵەت پێکەوە تەبان و عیبادەت و سیاسەتیش بران، مزگەوت هیچ گیروگرفتێکی لەگەڵ بازاڕدا نیەو سەوداو مامەڵەو بازرگانی شەرعی و حەڵاڵیش ڕۆژێك لە ڕۆژان لەگەڵ نوێژو ڕۆژووو زیکرو فیکردا ناکۆکی یەکیان نەبووە!!

جا ئەو جۆرە کەسانە کە ئاوا باسی دین و سیاسەت و مزگەوت و عیبادەت دەکەن ئەگەر هەر قین لە دڵ و غەرەزاوی بن ئەوە شتێکی ترە، بەڵام ئەگەر لە ڕووی نەزانی و بێئاگایی یەوە ئەو قسانە بکەن، من ئامۆژگاری دڵسۆزانەیان دەکەم کە لەجیاتی تفەنگ بەتاریکی یەوە نان و چاویلکەی ڕۆژئاوا بە بەرچاوەوە نان، باشتر وایەو بگرە هەق وایە کە جوامێرانەو بوێرانە دان بە نەزانی و بێئاگایی خۆیان دا بهێنن و خۆیان لە نەزانینی ئاوێتە (الجهل المرکب) [١٣] قوتار بکەن، یان پرسیار لە ئیمەومامانی ئیسلامی بکەن و گوێمان لێبگرن تاکو ڕاستگۆیانە بۆیان باسی ئەو مەسەلەو بابەتانە بکەین، یان لانی کەم خۆیان دەست بکەن بە موتاڵاو لێکۆڵینەوە لە قورئان و سوننەت و کتێب و بەرهەمی زانایان، تاکو وەك لە سەرەتای وتارەکەمەوە گوتم لە زاری ئەهلی ئیسلام و لە سەرچاوەی خودی ئیسلامەوە ئیسلام وەربگرن و لە ڕاستی یەکانی حاڵی بن، کە بێگومان ئەمەش مەرجی سەرەکی و هەرە گرنگی هەق دۆزینەوەیە بۆ هەرکەسێك کە دڵسۆزانە بە دوایدا بگەڕێ.

---

[١٣] نەزانین (الجهل) دوو جۆرە: ١- نەزانینی سادە (الجهل البسیط) کە بریتی یە لە نەزانینی شتێك، ٢- نەزانینی ئاوێتە (الجهل المرکب) کە بریتی یە لە نەزانینی شتێك و بەو نەزانی یەی خۆی نەزانینیش، واتە، نەزانیێ و نەشزانێ کە نازانێ، جابێگومان چارەسەری جۆری یەکەمیان زۆر ئاسانترە لە هی دووەمیان؛ چونکە هی دووەمیان بە دوو قۆناغان چارەسەر دەکرێ؛ یەکەم جار پێ نەزانینی نەزانینەکەو پاشان نەسڵی نەزانینەکە.

# پاڕانەوەی کۆتایی

لەکۆتایی‌دا لەخوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە:

خوایە بە لوتف و کەرەمی خۆت ئێمەی مسوڵمانانی کوردستان هەمووڵایەکمان هیدایەت بدەی کە چاکتر لە دینەکەت تێبگەین، خوایە زیاتر لە ڕووی قورئان و سوننەتەوە لە بەرنامەی خۆت شارەزامان بکەی، پەروەردگارمان هێندە دڵسۆزیمان بۆ میللەتەکەمان پێ ببەخشە کە بەزەییمان پێدا بێتەوەو نەهێڵین ئەم دینەی لە دەست بچێ کە مایەی عیززەت و بەختەوەری دنیاو دواڕۆژیەتی.

خوایە لە کەسانێک نەبین کە پەرچ دەخەنە ڕێگای دینداری و مسوڵمانەتی، خوایە لەو کەسانەمان نەگێڕی کەماڵەکانی تۆ وێران دەکەن و یارمەتی‌مان بدە کە لە ئاوەدان کەرەوانی ماڵەکانت بین، خوایە ئەم مزگەوت و ماڵانەی خۆتمان لە کوردستان و غەیری کوردستانیش دا بۆ ئاوەدان ترو شوعلەوەرتر بکە، زیاتر بیانکە بە کانگای عیبادەت و پەروەردەو فێرکردن و جێگای تێدا ڕوون کرانەوەی ڕاستی‌یەکانی ئایینەکەت.

پەروەردگارمان هەرکەسێک کە چاکەو بەرژەوەندی ئەم میللەتەی دەوێ یاریدەی بدەو کاروباری بۆ ئاسان بکە، وە هەرکەسێک کە نیازی خراپی لەگەڵ ئەم میللەتە هەیە خوایە دەستی ببڕەو دەرفەتی مەدە، خوایە شیفای نەخۆشەکانمان بدە، گیرو گرفتەکانمان بۆ ئاسان بکە، بەبەزەیی و بەخششی خۆت لەگەڵمان ڕەفتار بکە نەک بە خراپەی خۆمان، ئاوی ڕەحمەتی خۆتمان بەسەردا بڕێژە، سەربەرزو ڕووسووری ئێرەو ئەولامان بکە، بە دیداری خۆت و پێغەمبەری خۆتمان شاد بکە ئـــــامـــــین.

١٩ی شەووال ١٤١٩

١٩٩٩/٢/٥

سلێمانی / مزگەوتی جیهاد.

# چەند ڕوونکردنەوەیەکی تر دەربارەی مزگەوت

١) بۆ هەرکەسێك کە دەچێتە ژووری مزگەوت لەهەرکاتێك دا بێ سوننەتە دوو ڕکات نوێژ بکات کە بەو نوێژەی دەگوترێ سلاوی مزگەوت (تحية المسجد)، (ابو قتادة) خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ:

چوومە مزگەوت و پێغەمبەری خواش (ﷺ) دانیشتبوو لەنێو خەڵکیدا، منیش دانیشتم پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بۆچی بەر لەدانیشتن دوو ڕکاتت نەکرد؟ دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بینیم تۆ دانیشتوی و خەڵکیش دانیشتوە، فەرمووی: **{فـإذا دخـل أحدكـم المسجد فلا يجلس حتى يركع ركعتين}** رواه مسلم.

واتە: هەرکات یەکێکتان چووە مزگەوت با دانەنیشێ هەتا دووڕکات نوێژ دەکات.

٢) پێویستە ئینسان بە ئارامی و ویقارەوە بەرەو مزگەوت بێ و ڕاکەڕاك نەکات، (ابو قتادة) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ئێمە لە کاتێك نوێژمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەکرد غەڵبەغەڵبێکی بیست، فەرمووی: ئەوە چیتانە؟ گوتیان: پەلەمان کرد بۆ نوێژەکە، فەرمووی: **{فلا تفعلوا، اذا أتيتم الصلاة فعليكم السكينة فما أدركتم فصلوا وما سبقكم فأتموا}** رواه مسلم.

واتە: وا مەکەن، ئەگەر بۆ نوێژ هاتن بەئارامی وەرن، جا ئەوەندەی فریاکەوتن بیکەن و ئەوەی ئیمامیش پێشتان کەوتبوو دوایی تەواوی بکەن.

٣) هەنگاونان بەرەو مزگەوت بۆ نوێژو طاعەت مایەی سڕرانەوەی گوناهان و بەرز کرانەوەی پلانە، (ابو هريرة) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

**{من تطهر في بيته ثم مشى الى بيت من بيوت الله ليقضي فريضة من فرائض الله، كانت خطواته احداهما تحط خطيئة والاخرى ترفع درجة}** رواه مسلم.

واته: هەرکەسێك لە ماڵی خۆی دەستنوێژ بگرێ پاشان بەرەو ماڵێك لە ماڵەکانی خوا بڕوات بۆ ئەنجام دانی فەرزێك لە فەرزەکانی خوا ئەوە هەنگاوەکانی یەکێیان گوناهێکی لێدەکاتەوەو ئەوی تریشیان پلەیەکی بۆ بەرزدەکاتەوە.

٤) دڵ پەیوەست بوون بە مزگەوتەوەو هۆگر بوونی و هاموشۆکردنی نیشانەی ئیمانو مایەی ڕەزامەندی خوایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو فەرموودەیەیدا کە مۆژدە بە حەوت جۆرە کەس دەدات کە خوای بەخشەر لە ڕۆژی دوایی دەیانخاتە سێبەری بەزەیی‌خۆیەوە کە جگە لە سێبەرو پەنای ئەو هیچ سێبەرو پەنایەکی دیکە نیە. یەکێك لەو حەوت جۆرە کەسانە کابرایەکە دڵی بەمزگەوتەکانەوە پەیوەستە {**سبعة يظلهم الله في يوم لا ظل الا ظله ... ورجل قلبه معلق بالمساجد**} متفق عليه.

وە هەروەها فەرموویەتی: {**اذا رأيتم الرجل يعتاد المسجد فاشهدوا له بالايمان، قال الله عز وجل. (انما يعمر مساجد الله من آمن بالله واليوم الآخر..**} رواه الترمزي وقال: حديث حسن.

واتە: هەرکات کابراتان دی هۆگری مزگەوت بوو شایەدی ئیمانی بۆ بدەن، خوای زاڵو پایەبەرز فەرموویەتی: تەنها ئەوانە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکەنەوە کە بڕوایان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە..)).

٥) مانەوە لە مزگەوت بەمەبەستی چاوەڕوان کردنی کاتی نوێژ خواپەرستی‌یەکی گەورەیەو بەجۆرێك لە سەنگەرگرتنو ئێشکچیەتی دادەنرێ، پێغەمبەر (ﷺ) لەوبارەوە فەرموویەتی: {**الملائكة تصلي علىٰ أحدكم مادام في مُصَلاّهُ الذي صَلّى فيه مالم يُحْدِثْ، تقول: اللهم اغفر له اللهم ارحمه**} رواه البخاري.

واتە: فریشتەکان بۆ یەکێکتان دەپاڕێنەوە هەتا لەو شوێنە بێ نوێژی تێداکردووە بەمەرجێك بێدەست نوێژ نەبووبێ، دەڵێن: ئەی خوایە لێی ببورە، ئەی خوایە بەزەییت پێیدا بێت.

هەروەها فەرموویەتی: {وانتظار الصلاة بعد الصلاة فذالكم الرباط فذالكم الرباط} رواه مسلم.

واتە: وە چاوەڕوانیکردنی کردنی نوێژ دوای نوێژ ئائەوەتان ئێشکە گرتنە ئائەوەتان پاسەوانێتیيە.

٦) نەچوونە دەر لە مزگەوت پاش بانگ دران، چونكە (ابو العشاء) دەگێڕێتەوە دەڵێ:

جارێكیان لە مزگەوت لەلای (ابوهريرة) دانیشتبووین بانگدەر بانگی داو كابرایەك هەستا ڕۆیشت، (ابوهريرة) ش هەتا لە مزگەوت چووە دەرێ چاوی تێیەوە بوو، ئینجا (ابو هريرة) گوتی:

((أما هذا فقد عصى أبا القاسم -ﷺ-)) رواه مسلم. واتە: بەلام ئەم پیاوە ئەوە بێگومان سەرپێچی فەرمانی (أبو القاسم) (ﷺ) ی كرد.

٧) سەفەركردن بۆلای هیچ مزگەوتێك بەمەبەستی خواپەرستی تێداكردن دروست نیە، بێجگە لە سێ مزگەوتەكان كە مزگەوتی حەڕام و مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) و مزگەوتی (اقصى)ن، ئەویش لەبەرئەوەی كەنوێژو عیبادەت لەو سێ مزگەوتەدا بەچەند قات خێرو پاداشتی زیاترە لە باقی مزگەوتەكان، ئەمەش چەند فەرموودەیەك لەو بارەوە:

{لاتشد الرحال الا الى ثلاثة مساجد: المسجد الحرام و مسجدي هذا والمسجد الاقصى} متفق عليه.

واتە: نابێ بارگەو بنەی سەفەر بپێچرێتەوە بۆ هیچ مزگەوتێك مەگەر بۆ سێ مزگەوتان: مزگەوتی (حەڕام) و (ئەم مزگەوتەی من) و مزگەوتی (ئەقصا).

وە دەربارەی خێرو پاداشتی نوێژو طاعەت لە مزگەوتی حەڕام و مزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) فەرموویەتی:

{صلاة في مسجدي هذا خير من الف صلاة فيما سواه من المساجد الا المسجد الحرام} متفق عليه.

واته: نوێژکردن لەم مزگەوتەم دا لە هەزار نوێژی مزگەوتەکانی دیکە گەورەترەو خێرترە جگە لە مزگەوتی حەرام.

دەربارەی مزگەوتی حەرام (المسجد الحرام) یش فەرموویەتی: **{وصلاة في المسجد الحرام أفضل من مائة ألف صلاة في سواه}** رواه احمد وابن ماجه واسناده صحيح.

دەربارەی ئیمتیازی نوێژو طاعەتیش لە مزگەوتی قودس دا چەند فەرموودەیەك گێڕراونەوە جا لەسەر ئەساسی ئەو فەرموودانە زانایان لەبارەی خێرو پاداشتی طاعەتی مزگەوتی ناوبراو ڕایان جیا جیایە، هەندێکیان دەڵێن: نوێژێك لەوێدا بە حەوسەد (٧٠٠) نوێژی شوێنی تر هەیە، [14] هەندێکیش دەڵێن : بە پێنج سەد (٥٠٠) و، هەندێکیش دەڵێن: بە پەنجا (٥٠). [15]

٨) دروست نیە مزگەوت لەسەر گۆڕی هیچ کەسێك دروست بکرێ، یان هیچ مردوویەك لە مزگەوت دا بنێژرێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوبارەوە فەرموویەتی: **{لعنة الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور انبياءهم مساجد}** متفق عليه.

واتە: لەعنەتی خوا لە جوولەکەو دیانەکان بێ گۆڕی پێغەمبەرانی خۆیانیان کردنە مزگەوت.

٩) هەرکات ئینسانی مسوڵمان مزگەوتی چنگ نەکەوت هەموو سەرزەوی – بێجگە لەو شوێنە تایبەتییانەی قەدەغەکراون بۆ نوێژ تێداکردن – بە پاك دادەنرێ و نوێژی لەسەر دەکرێ، پێغەمبەر (ﷺ) لەو بارەوە فەرموویەتی: **{فضلت على الانبياء بست: أعطيت جوامع الكلم، ونصرت بالرعب، واحلت لي الغنائم، وجعلت لي الارض طهوراً ومسجداً، وارسلت الى الخلق كافة، وختم بي النبيون}** رواه مسلم.

---

[14] بڕوانە: (الآداب الشريعة) ی ابن مفلح المقدسي. ج٤ ص٧٤.

[15] بڕوانە (مجموع الفتاوى) ج٢٧ ص٨.

واتە: ئەش ئیمتیازم بەسەر پێغەمبەراندا هەن. وشەو دەربڕینە کورتە پڕماناکانم پێدراون، وە بەهۆی ترس — خرانە دڵی دوژمنم — دووە سەرخراوم، وە دەستکەوتەکانی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراوە، وە زەویم بۆ کراوە بە پاك و پاککەرەوەو جێگای نوێژ، وە بۆ سەرجەم خەڵکی ڕەوانەکراوم، وە کۆتایی پێغەمبەرانم پێهێنراوە.

١٠) ئافرەتانیش وەك پیاوان بۆیان هەیە بچنە مزگەوتەکان بۆ نوێژو طاعەت. وە پیاوان — باب و براو مێرد و خزم — بۆیان نیە مەنعیان بکەن. وەك پێغەمبەر (ﷺ). فەرموویەتی:

{لاتمنعوا اماء الله مساجد الله} متفق علیه. واتە: بەندە - مێینە — کانی خوا لە مزگەوتەکانی خوا مەنع مەکەن، بەڵام نابێ خۆیان بڕازێننەوەو خۆیان بۆنخۆش بکەن چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئافرەتانی فەرمووە:

{اذا شهدت إحْداكُنَّ المسجد فلا تمس طيباً}. رواه مسلم. واتە: ئەگەر یەکێکتان لە مزگەوت ئامادە بوو خۆی بۆنخۆش نەکات، هەروەها فەرموویەتی: {وليخرجن وهن تَفِلات} رواه ابو داود واحمد.

واتە: با بە ئەمیەت بە خۆنەدانەوە بچنە دەرێ — مەبەست خۆنەڕازاندنەوەو بۆنی خۆش لەخۆنەدانە.

دیارە ئەگەر ئافرەتان بەومەرجانەوە پابەند نەبن و بۆ خۆ ڕانواندن و جوانی خۆ دەرخستن بچنە مزگەوت، ئەوە لەجیاتی خێر تووشی گوناح دەبن، هەربۆیەش (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی:

{لو ادرك رسول الله ما أحدث النساء لمنعهن كما منعت نساء بني اسرائيل} متفق علیه.

واتە: ئەگەر پێغەمبەری خوا ئەوەی بینیبایە کە ئافرەتان دایان هێناوە — لە خۆڕازاندنەوە — ئەوە بێگومان مەنعی دەکردن وەك چۆن کاتی خۆی ئافرەتانی بەنیئیسرائیل قەدەغەکران بچنە پەرستگاکان.

١١) هیچ جۆره چالاكیەكی عیلمیی و پەروەردەیی و كۆمەڵایەتی و سیاسی و جیهادی و ئەدەبی لە مزگەوتدا قەدەغە ناكرێ، بەمەرجێك شەرعی بن و لە سنوورەكانی شەرع دا ئەنجام بدرێن و، بارودۆخ و جەووی پڕ ڕێزو حورمەتی مزگەوتیشیان تێدا ڕەچاو بكرێ، خاوەنی كتێبی (الآداب الشرعية) دەربارەی مزگەوت چەند كورتە باسێكی هێناوە یەكێكیان ناوونیشانەكەی ئاوایە:

((فصل: يصان المسجد عن كلام و شعر قبيح وغناء وصبي ومجنون ويباح فيه اللعب بالسلاح)) [16].

واتە: بەشێك: مزگەوت دەپارێزرێ لە قسەو لە شیعری ناشیرین، وە لەگۆرانی گوتن، وە لە منداڵ و لە شێت، وە دروستە بە چەك مەشق و یاری تێدا بكرێ. هەروەها ناوونیشانی یەكێ تر لە كورتە باسەكانی ئاوایە:

((فصل: في صيانة المسجد عن كل حدث ونجس واغلاق أبوابه لمنع المنكر فيه)) [17]

واتە: بەشێك: دەربارەی پاراستنی مزگەوت لە هەرشتێك كەئینسان بەبێ دەستنوێژ بكات و لەهەر پیسی یەك، وە داخستنی دەرگاكانی بۆ نەهێشتنی هەر خراپەو ناشەرعی یەك كە تێیدا بكرێ.

كەواتە: مزگەوت جێگای تایبەتی بەزایەتی بۆ خوا كردن و پەرستنیەتی بە هەموو جۆرو شێوەكانی پەرستن، بەڵام پێویستە لە هەموو ڕوویەكەوە ڕێزو حورمەتی ڕابگیرێ و شتێكی تێدا نەكرێ پێچەوانەی ڕێزو حورمەتی بێت و لەگەڵ پلەوپایەی بەرزیدا نەگونجێ.

---

[16] (الاداب الشرعية) ج٤ ص ٣٢. ابن المفلح المقدسي.

[17] سەرچاوەی پێشوو ج٤ ص ٣٨.

# دواقسەم/ چەند ئامۆژگاری‌یەك بۆ ئەهلی مزگەوت

كۆتایی ئەم بابەتە كە مەبەستم پێ‌ی ڕوونكردنەوەی گرنگی‌و پلەوپایەو ڕۆڵی مزگەوت‌و بەرگری كردنە لە ڕێزو حورمەتی مزگەوتەكانی خوا، كە بەداخەوە لەم ڕۆژانەدا لە كوردستان‌و لەزۆر جێگای دیكەی جیهانی ئیسلامیش دا دەكەونە بەر پەلاماری وێرانكاری‌و ئیهانە پێ‌كران‌و، بەبیانووی: ((پاراستنی قودسیەتی مزگەوتەكان)) ماڵەكانی خوا ڕێزو حورمەتیان دەشكێنرێ!! جا بێگومان ئەمەش یەكێكە لەشتە سەر سووڕهێنەرەكانی دنیا، كە بەناوو بەبیانووی پاراستنی قودسیەت‌و كەرامەتی كەسێك یان شوێنێكەوە، هەر ئەو كەرامەت‌و حورمەتەی بشكێنرێ كە بەحیساب بەرگری لێ دەكرێ!! بەڵام مەخابن كەلەم دنیاو ڕۆژگارە سەیرەدا و لەسایەی شوومی نەفامێتی‌و حوكم‌و سەروەری ئینسان بەسەر ئینسانەكان، یان سەید بەسەر كۆیلەكان دا، گەلێك شتی سەیرو عەجایب لەلای خەڵكی بوونەتە شتی سادەو ئاسایی!

بەڵێ جا لەكۆتایی‌دا ئەم چەند ئامۆژگاریانە ئاڕاستەی ئەهلی مزگەوت بەگشتی‌و بەتایبەت ئیسلامیەكان دەكەم:

١)خۆتان ئاساو لە پێشوو پتر گەرم‌و گوڕو گورج‌و گۆڵ بن بۆ ئاوەدان كردنەوەی ماڵەكانی خوای پەروەردگار بە هەموو جۆرو شێوەكانی خواپەرستی، لەگەڵ ڕەچاو كردنی ئەو پەڕی وریایی لەهەر سێك مەرجی گرنگی: بەس بۆ خوا بوون دا(الاخلاص)و بەپێ‌ی شەرع بوون(الاتباع)و بەس دڵ بە بەخشندەیی خوا خۆشبوون‌و لە خۆبایی‌و بەخۆسەرسام نەبوون(عدم الغرور والعجب).

٢) بە هیچ ڕەنگێك‌و لەژێر فشاری هیچ هەڕەشەو ترساندن‌و بانگەشەی چەواشە كردندا دەستتان لە مزگەوتەكانی شل نەبێ‌و پێ‌یان لێ مەبڕن، مادام بەهۆگر بوونی ماڵەكانی خوا مژدەی چوونە ژێر سایەو

ڕەحمەتی خوای پەروەردگارمان پێ بدرێ، ماقووڵ نیە جگە لەخوا ترسمان لە کەسێکیترو ئومێدمان بەلایەکیتر هەبێ.

٣) بەردەوامو پشوو درێژانە لەسەر تێگەیشتنی خۆتانو حاڵی کردنو پەروەردەکردنی براو خوشكو قوتابییەکانتان سووربن، لەسەر بناغەی خوا بەیەکگرتن(التوحید)و شوێن پێی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵگرتن(الاتباع)و لەبەر رۆشنایی قورئانو سوننەت داو بە بەهرەمەند بوون لە بەرهەمو کەلەپووری زاناو پێشەوایانی ڕەسەنمان.

٤) ئەمان سەد ئەمان وریای ڕووحی دەمارگیری حیزبیو ماڵماڵۆکێنە بنو خۆتانو شاگردەکانتانی لێ بپارێزنو. بەعەقڵو دڵێکی گەورەو فراوانەوە لەگەڵ یەکتردا هەڵسو کەوت بکەنو، باگیانی تەسکی حیزبایەتی واتان لێ نەکات کە تەنها لایەنێك یان چەند لایەنێك لەئیسلام بگرنو لە کاردانەوەی کۆمەڵە مسوڵمانێك دا - خوانەکردە - بەرانبەر بە لایەنێك یان چەند لایەنێکی دیکەی بەرنامەیخوا دووچاری دەردو نەخۆشی حەساسییەت بن!

٥) بەبێ خۆساف کردنەوەو بۆ خوا ساغ بوونەوەو چاکبوونو پاکبوون کە وشەی(تزکیة) ناوونیشانیەتی، نەلە دنیاو نەلە قیامەت بە هیچ نابینو بە هیچ ناگەین، جا تکای برایانەم ئەوەیە کە هەوڵی جیددی لەو بارەوە لەگەڵ خۆتانو دەوروبەرتان دا بدەن، هەڵبەتە بەئەندازەی پەیدابوونی حاڵەتی تەزکیە بوونیش سەرفرازی دنیاو قیامەتو ساغو سەلامەتیو سەربڵندی نێو دۆستو دوژمنیش مسۆگەر دەکەین، وە بازۆر باش بزانین کە زۆربەی هەرە زۆری گیروگرفتو تێك گیرانەکانمان سەرچاوەکەیان دڵو دەروونمانە، لە کاتێك دا دەبێ بە زبڵدانی خەسڵەتە بەدەکان(رذائل)ی وەك: خۆبەزلگریو حەسەدو بوغزو غەرەزو خۆپەسەندیو ... هتد.

٦) زۆر شتێکی بێ جێو ناماقووڵە کەلە حاڵێك دا خۆمان بە نوێکەرەوەی ئاینو بەرزکەرەوەی بەیداخەکەی دەزانین، بەهۆی هەڵەو پەڵەو ناشەرعییەکانمان لەگەڵ خەڵكو دەوروبەر بە مسوڵمانو

نامسوڵمانەوە، ببینە ناشیرین کەری ئاینو بەرنامەی بێ هەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێو دادگەرو، لەجیاتی نزیک خستنەوەو سەرنج ڕاکێشانیان وایان لێ بکەین بسڵەمنەوەو بەدبین بین!

٧) مشتو مڕو تێک گیران لەسەر مزگەوتەکانو چۆنیەتی دەرسو دەورو ووتار خوێندنەوەو... هتد تێیان دا، لەنێو خۆمان دا، هەڵەیەکی زۆر گەورەو جەرگ بڕە، چونکە هەم دەبێتە هۆی تێکدانو شێواندنی جەووی مزگەوتەکان، هەم هەموویان زۆربەی ئەو طاعەتو کارە باشانەی لە مزگەوت دەیانکەین لێمان هەڵدەوەشێنەوە: ﴿یاایها الذین آمنوا اطیعوا الله واطیعوا الرسول ولاتبطلوا اعمالکم﴾ (محمد:٣٣). وە هەم دەبێتە هۆی بیانوو دانە دەستو زارکردنەوەو زمان درێژتر بوونی ئەوانەی کە هەمیشە لێمان لە کەمین دانو ماددەیەکی پڕوپاگەندەیی بە پێزیان دەست دەکەوێ بۆ ناوزڕاندنو ناشیرین کردنمان لەبەر چاوی جەماوەرو، پاشان بیانووشیان دەست دەکەوێ بۆ چەواشە کردنی خەڵکی سادەو عەوام، کە دوایی بەناوی (پاراستنی قودسیەتی مزگەوتەکان) کەڕاهەتو حورمەتی مزگەوتەکان هەرچی زیاتر پێشێل بکەنو سەرباری هەموو خەمان ئێمەو مانان تاوانبارو خۆشیان پیاو باش بکەن!!

جا بێگومان هەڵەو تاوانێک هێندە بێڕەزاو گرچوو بربێ، دەبێ هەموو خاوەن ئیمانو عەقڵو ویژدانێک خۆی لێ بپارێزێو، لەسەر ئەوانەش کەسەر پەرشتی مزگەوتەکانو کارو چالاکیە ئیسلامیەکان دەکەن پێویستە، زۆر بەتوندی لەوجۆرە کەسانە بپێچنەوەو چاودێریان بکەنو سزای پڕبە پێستیشیان بدەن، چونکە هیچ گومانی تێدا نیە کە ئەو جۆرە کەسانە، یان مسوڵمانو دۆستی نەزانن، یان نامسوڵمانو دوژمنی زۆرزانن، لە هەر دووک حاڵەتیش دا لێپرسینەوەو سزاو تۆڵە پێویستە.

# نیوه رۆك



ژمارە سپاردنی (١٢٩) ی ساڵی ١٩٩٩ی وەزارەتی ڕۆشنبیری دراوەتێ

## ئەم ئامیلکەیە بۆ؟!

مزگەوتەکان، ماڵەکانی خوا - تبارک و تعالی - کە جێگای تایبەتی خواپەرستیو بەندایەتی کردنن بە هەموو جۆرو شێوەکانی دینداریيەوە، وە کانگاو مەڵبەندی پێگەیاندن و پێگەیاندنی مسوڵمانانن بە نێرومێو وردو درشتەوە، ماوەیەکە لەلایەن برادەرانی عەلمانیو سیکولاریستەوە بەرێکخستنە حیزبییەکانو دامودەزگا ڕەسمییەکانی هەردووک بەشە ئیدارەکەی هەرێمەوە، کەوتوونەتە بەر پەلامارێکی توندا بۆیە بە پێویستم زانی لەبەر ڕۆشنایی دەقە بێ پێچو پەناکانی قورئانو سوننەتو هەڵسەنگاندنی عەقڵدا، سەرنجێکی ئەو کێشەیە بدەین - کە بێگومان گێچەڵێکە بەخێتو خۆڕایی یەخەی ئەهلی مزگەوتی گرتووە - و دەری بخەین دا خوا لە ڕوانگەی شەرعو عەقڵەوە ئەو قسەو قاڵانەی ئەو برادەرانە دەیانکەنە پاساوو دەستە چیلەی پیانوو بە مزگەوتو ئەهلی مزگەوت گرتن بنایی چەندنو چۆن لەمەحەکی نەقڵو عەقڵ دەردەچن!!